بەرهەمی پرۆژەی خێرخوازی ئیمان

# ١٠٠ فەرموودەی سیانی

# لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وآله وسلم)


ئامادەکردنی:

حەیدەر عەلی هانەسورەیی


١٤٣٦ ك - ٢٠١٦ ز

ناوی کتێب: ١٠٠ فەرموودەی سیانی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)
ئامادەکردنی: حەیدەر عەلی هانەسوورەیی
دیزاین: گۆڤاری بڕیار
نۆبەی چاپ: یەکەم
ساڵی چاپ: ٢٠١٦ ز - ١٤٣٧ ك
تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
چاپخانە: پیرەمێرد
ژمارەی سپاردنی لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارەی «      »ی ساڵی ٢٠١٦ی پێ دراوە

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله، نحمدُه ونستغفره ونستعينه ونستهديه ونعوذُ بالله من شرورِ أنفسنا ومن سيئاتِ أعمالنا، من يهْدِ اللهُ فلا مضِلَّ له ومن يضلل فلا هادي له. وأشهد أنْ لا إله إلا اللهُ وحده لا شريك له وأشهد أنَّ محمداً عبدُه ورسولُه،

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ آل عمران

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ النساء

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب

فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد (صلى الله عليه وآله وسلم) وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.



## پێشەکی:-

## خوێنەرانی بەڕێز:

فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) سەرچاوەی دووەمی ئاینی پیرۆزی ئیسلامن ، ڕۆشن کەرەوەی واتا و مەبەستەکانی قورئانی پیرۆزن، زۆر ئایەت و فەرمــوودە لەوبارەیەوە هاتووە کە دەبێ ئێمەی باوەڕدار کار بەفەرمــان و بڕیارەکانــی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەین ئەوشــتانەی فەرمانــی پێکردووین ئەنجامیان بدەین ئەو شــتانەی کە بەرگری لێ کردوین وازیان لێ بهێنین وەك خوای گەورە لەچەندها ئایەتی پیرۆزدا جەختی لەسەر دەکاتەوەو دەفەرمووێ:

﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ ﴿٧﴾ ﴾ الحشر

﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَ ﴿٨٠﴾ ﴾ النساء

﴿ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُواْ ﴿٥٤﴾ ﴾ النور

﴿ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل

﴿ فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمۡ فِتۡنَةٌ أَوۡ يُصِيبَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾ النور

پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێ:

اذا نَهَيْتُكُــمْ عَنْ شيء فاجتَنِبــوه واذا أَمرتكم بشيء فأتوامنه ما استطعتُمْ. رواه مسلم رقم ١٣٣٧

لەبەر هەموو ئەم گرنگیانەیە زانایانی ئیسلام (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) زۆر خۆیان لەگەڵ فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ماندوکردووە و شەونوخونی



زۆریان لەگەڵدا کیشـاوە، هەتا سـاغیان کردونەتـەوە و داویانن لەپێژنگ (صحیح) و (حسن) (ضەعیف) و(موضوع) یان لێك جیاکردۆتەوە.

بۆیـە منیش کاتێك هەسـتم بەهەوڵ و ماندوویەتـی هەموو ئەو زانا بەڕێزانـە کرد، بڕیـارم دا دڵۆپێك لەدەریای هـەوڵ و ماندوبونی هەموو ئەو زانا بەڕێزانە بخەمە سـەر شـانی خۆم و هەسـتام بە کۆکردنەوە و ئامادەکردنـی ئەم فەرمووادنە، وە بڕیارمـدا بیکەم بە چەپکێ گوڵی بۆن خۆش و ڕازاوە و وەك دیارییەکی بەنرخ پێشکەشی خوێنەرانی خۆشەویستی کـورد زمانی بکەم بەو هیوایەی سـود بەخش بـن کەلێنێك پڕ بکەنەوە، داواکاریشم لە خوێنەرانی بەڕێزیش لەنزای خێر بێ بەشمان نەکەن.

بەڕێـزان ئـەم فەرموودانـەی کەلەبـەر دەسـتاندایە دوای گەڕان و ماندووبونێکـی زۆر کۆکراونەتـەوە و ئامادەکـراون گوڵبژێری چەندەها سەرچاوە و پەڕاوی بەهێز کراوە. کەلەکۆتای کتێبەکەدا ئاماژەیان پێکراوە.

ئەم فەرمودانە شێوازێك لەجوان کاری تازەگەری یان تێدایە.

ئەم فەرمودانە بۆ لەبەرکردن زۆر ئاسانن و درەنگ لەبیر دەچنەوە و حوکمی شەرعی زۆریشیان تێدا دەردەکەوێت.

سەرەڕای ئەمانەش سەرچاوەیەکی بەهێزە بۆ وتاربێژەکان وتاربێژی سـەرکەوتوو دەتوانیت هـەر دانەیەکیان بکاتە وتـاری هەینی یەك و چەندەها وتاریان لەسەر بدات.

لەهەمووی جوان تر ئەوەیە فەرموودەکان تەخریج و تەحقیق کراون و پلەی فەرموودەکان دیاری کراوە (صەحیحە) یان (حسنە) بۆ ئەوەی خوێنەر



بەدڵنیاییەوە وەریان بگرێت و کاریان پێ بکات، هەروەها سەرباسیش بۆ هەموو فەرموودەکان دانراوە بەزمانی کوردی دەبا هەموومان ئەم فەرموودانە بخوێنینەوە لەبەریان بکەین و کاریان پێبکەین.

لەواتا و مەبەستەکانیان وردبینەوە لەئاکار و کردەوەکانماندا لەمامەڵە و کڕین و فرۆشتنماندا لەماڵەوە و دەرەوە و مزگەوتماندا بابەجوانی ڕەنگ بدەنەوە جا ئەو کاتە دەبینە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەری خوا (ﷺ)

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ﴾ (٣١) آل عمران

لەکۆتایدا زۆر ڕیز و پێزانین دوعای خێرم هەیە بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە هاندەرم بوون بۆ کۆکردنەوەو ئامادەکردنی ئەم فەرموودانە و یارمەتییان دام بۆ ساغ کردنەوەی هەندێ لەواتای فەرموودەکان و پێداچونەوە و ئەم فەرموودانە یان کرد هەروەها زۆر ڕێزو پێزانین و دوعای خێریشم هەیە بۆ برایانی بەڕێوەبەری پرۆژەی خێرخوازی ئیمان کە هەستان بە کۆمپیوتەر و لە چاپدان ی دیزاین و بلاوکردنەوەی ئەم فەرموودانە خوای گەورە پاداشتی خێریان بداتەوەو نموونەیان هەر زۆر بێ.

وصلى الله تعالى وسلم وبارك على محمد و على اله و اصحابه ومن تبعهم باحسان الى يوم الدين

**حيدر علي احمد**

**هەلەبجەی شەهید**



## فەرموودەی (١)

**هەرکەسێ سێ نیشانەی تێدابێ لەزەت و شیرینایەتی ئیمان دەچێژێ:-**

عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِنَّ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ: أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّه، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ بَعْدَ أَنْ أَنْقَذَهُ اللهُ مِنْهُ، كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ)[١]

**واتا: ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیگێڕێتەوە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:**

**هەرکەسێ سێ نیشانەی تێدابێ لەزەت و شیرینایەتی ئیمان چەشتووە:-**

**١- خواو پێغەمبەری خوای لەهەموو شتێك زیاتر خۆش بوێت،**

**٢- وەهەرکەسێکی خۆشبوێت تەنها لەبەر خوا بێت،**

**٣- وە چەندی پێ ناخۆشە دەستی بگرن و فرێیی دەنە ناو ئاگرێکەوە ئەبێ ئاواش پێی ناخۆش بێت جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ کوفر و بێ باوەڕی.**

---

١- حديث صحيح رواه البخارى ١/٥٦ و مسلم ٤٣ والترمذي ٢٦٣٤ والنسائي ٩٦/٨



## فەرموودەی (٢)

**سێ شت هەن کە ڕویاندا باوەڕهێنان سودی نامێنێ:-**

عَـنْ أَبِـي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه)، قَـالَ: قَالَ رَسُولُ اللـهِ (ﷺ): ثَلَاثٌ إِذَا خَرَجْـنَ لَمْ يَنْفَعْ نَفْسًـا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِـنْ قَبْلُ، أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَـا خَيْرًا: طُلُـوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَـا، وَالدُّخَانُ، وَدَابَّةُ الْأَرْض[٢].

**واتا: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ:-**

**پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

**سێ شت هەن کە ڕویان دا باوەڕهێنان سودی نامێنێ ئەگەر کەسێك لـەوەو پێش باوەڕی نەهێنابــێ یان لەبازنەی باوەڕدا کارێکی باشــی ئەنجام نەدابێ:**

**١- خۆر هەڵهاتن لە خۆر ئاواوە،**

**٢- دەرکەوتنی دەجال،**

**٣- دەرچوونــی (دابة الارض)، زیندەوەرێکــە لەزەویدا دەردەچێ و دەکەوێتە فیتنە کردن لەگەڵ خەڵکدا.**

---

٢- حديث صحيح رواه مسلم ٣٩٦/٢ والترمذى ٣٧٢ واحمد ٤٤٥/٢



## فەرموودەی (٣)

**سێ نزاو پاڕانەوە بەبێ گومان وەڵام دەدرێنەوە :-**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)، قَالَ: "ثَلاثُ دَعَوَاتٍ مُسْتَجَابَاتٍ لا شَكَّ فِيهِنَّ: دَعْوَةُ الْوَالِدِ، وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ، وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ[٣].

**واتا : ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی:-**

**پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

**نزاو پاڕانەوەی سێ کەس هەیە خوای گەورە بەبێ گومان وەڵامیان دەداتەوە:-**

**١- نزاو پارانەوەی باوك بۆ منداڵەكانی،**

**٢- نزاو پارانەوەی كەسێكی ستەم لێ كراو،**

**٣- نزاو پارانەوەی ڕێبوار (المسافیر).**

---

٣- حديث حسن رواه البخارى في الادب المفرد وابو داود ١٥٣٦ والترمذى ١٩٠٦ واخرجه ابن ماجه ٣٨٦٢ وابن الحبان ٢٤٠٦ وفي صحيح الجامع باب فضل الدعاء رقم ١٨ وفي السلسلة الصحيحة رقم ٥٩٦



## فەرموودەی ( ٤ )

**سێ شت مایەی خۆشگوزەرانییە لە دونیادا بۆ مرۆڤی موسڵمان:**

عــن نافع (رضي الله عنه) قــال: قال رسول الله (ﷺ) ثــلاثُ خِصالٍ من سعادَةِ المرْءِ المسلِمِ في الدنيــا: الجارُ الصالِحُ، والمسْكَنُ الواسِعُ، والمركَبُ الهَنِيءُ[٤].

**واتا: نافیعی کوری عبدالحەرس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی:-**

**پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

**سێ شت لەدونیادا مایەی خۆش گوزەرانی یە بۆ مرۆڤی موسڵمان :**

**١- دراوسێی باش،**

**٢- خانــوو بەرەیەکی فــراوان و باش نزیك لــە مزگەوت وخاوەن دراوسێی باش.**

**٣- سوارییەکی باش وەك سەیارەو ئەسپ...**

---

٤- حديث صحيح رواه احمد في مسنده والطبراني في الاوسط والحاكم في المستدرك وفي السلسلة الاحاديث الصحيحــة رقم ٢٨٢ وفي صحيح الجامع الصغير رقم ٣٠٩ وفي فيض القدير رقم ٣٤٦٠.



## فەرموودەی ( ٥ )

**سێ شت هەیە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێ ئەنجامی بدات :-**

عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وآله وسلم): "ثَلاثٌ كُلُّهُنَّ حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ : عِيَادَةُ الْمَرِيضِ، وَشُهُودُ الْجَنَازَةِ، وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ إِذَا حَمِدَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ"[٥].

**ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وآله وسلم) فەرموویەتی:**

**سێ شت هەیە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك هەستێت بەئەنجام دانیان:**

**١- سەردانی نەخۆش،**

**٢- بەشداری کردن لەبەرێکرنی جەنازەدا،**

**٣- وەڵام دانەوەی ئەو کەسەی کە دەپژمێ بە (یَرْحَمُكَ الله) بە مەرجێ بلێ (الحمدلله).**

---

٥- رواه البخاری في الادب المفرد والسلسلة الاحاديث الصحيحة ٣٠٣٥ وفي صحيح الجامع رقم ٩ باب مشي مع الجنازة وفي فيض القدير رقم ٣٤٥٩



## فەرموودەی (٦)

**سێ کات نوێژیان تێدا ناکرێت و مردویان تێدا نانێژرێت:**

عَـنْ عُقبَة بن عـامر (رضي الله عنه) قال: ثَـلاثُ ساعات كان رسول الله (ﷺ) ينهانــا أَن نصلي فيهن أو نقبر فيهن مَوتــا حين تطلُعُ الشمسُ بازغةُ حتى تَرْتَفِعَ ، وَحِـينَ يقوم قائمُ الظهيرة حتى تزول الشمسُ وَحينَ تُضيفُ الشمس للغُرُوب حتى تغرُب[٦].

**واتا عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی:-**

**پێغەمبەر (ﷺ) لە ســێ کاتا بەرگری و قەدەغەی لێ دەکردین کە نوێژیان تێدا بکەین و مردوویان تێدا بنێژین:**

**١- ئەو کاتەی کە خۆر هەڵدێت تا بەئەندازەی ڕمێك بەرزدەبێتەوە،**

**٢- ئەو کاتەش کە گەرمای نیوەڕۆیە و هەموو شــتێکی ڕاوەســتاو لەبــەر خۆر ســێبەری نامێنێ، هەتا خۆر لەناوەڕاســتی ئاســمان تێ دەپەڕێت.**

**٣- ئەو کاتەی خۆر بەرەو نیشتن و ئاوابوون دەڕوات تا ئاوا دەبێت.**

---

٦- حديــث صحيح رواه مسلم١٩٢٦ و أبــو داود ٣١٩٢ والترمذي ١٠٣٠ وابن ماجه ١٥١٩



## فەرموودەی (٧)

**لەدوای خۆم دەترسم ئوممەتەکەم سێ شتیان بەسەر دابێ:**

عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رضي الله عنه)، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، يَقُولُ: "ثَلاثٌ أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي: الاسْتِسْقَاءُ بِالأَنْوَاءِ، وَحَيْفُ السُّلْطَانِ، وَتَكْذِيبٌ بِالْقَدَرِ"(٧).

**واتا جابری کوڕی سومرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەفەرموێ گوێم لێ بووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

**لەدوای خۆم دەترسم ئوممە تەکەم سێ شتیان بەسەردا بێ:**

**١- باوەر بهێنن بە ئەستیرە ناسی و داوای باران بکەن بەهۆی ئەستێرە و کەش و هەواوە.**

**٢- زوڵم و ستەمی کاربەدەستان و فەرمان ڕەوایان بیان گرێتەوە.**

**٣- قەزاو قەدەر و باوەڕ بەچارەنوس بەدرۆ بخەنەوەوە و باوەڕیان پێی نەمێنێ.**

---

٧- حديث صحيح رواه احمد في مسنده ، والطبراني في الكبير و انظر صحيح الجامع الصغير وزيادته للالباني رقم ٣٠٢٢



## فەرموودەی (٨)

**سێ شت لەباونەریتی سەردەمی نەفامییە:**

عـن مصعب بن عبيدالله بن جُنَـادَةَ بْنِ مَالِـكٍ (رضي الله عنه)، قَالَ: قَالَ رَسُـولُ اللَّهِ (ﷺ): " ثَلاثٌ مِنْ فِعْلِ الْجَاهِلِيَّـةِ لا يَدَعُهُنَّ أَهْلُ الإِسْلامِ: الأَسْتِسقاءُ بِالْكَوَاكِبِ وَطَعْنٌ فِي النَّسَبِ وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ "[٨].

**واتـا موصعەبی کـوڕی عوبەیدوڵڵا کوڕی جونـادەی کوڕی مالـیك (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:**

**سێ شـت لە داب و نەریتی سـەردەمی خەڵکی نەفامی یە خەڵکی موسڵمان وازی لێ ناهێنن:**

**١- داوای بـاران باریـن کـردن بەهۆی ئەسـتێرەوە کـە جۆرێکە لەهاوبەشی بڕیاردان بۆ خوا،**

**٢- تانە و تەشەردان لەبنەچە و ڕەچەڵەکی خەڵکی،**

**٣- شین و زاری و قاو قیژ کردن بەسەر مردودا.**

---

٨- حديـث صحيح رواه البخاری في التاريخ الكبـير ٢٢٣/١ والبزار ٧٩٧ وفی صحيح الجامع الصعير ٣٠٤٠ .

## فەرموودەی (٩)

**ســێ شت هەیە هەرکەسێ هەستێت بەئەنجام دانیان ئەوا بەڕاستی لەزەت و تامی ئیمان و باوەڕی چەشتووە:-**

عن عبد الله بن معاوية الغاضري من غاضرة قيس (رضي الله عنه) قال قال النبي (ﷺ) ثلاث مــن فعلهن فقد طعم طعم الإيمان من عبد الله وحده وأنــه لا إله إلا الله وأعطى زكاة مالــه طيبة بها نفسه رافدة عليــه كل عام ولا يعطي الهرمة ولا الدرنة ولا المريضة ولا الشرط اللئيمة ولكن من وسط أموالكم فإن الله لم يسألكم خيره ولم يأمركم بشره[٩] وزكى نفسه.

**واتــا عەبدوڵڵای کــوڕی موعاویــەی غاضــري (ڕەزای خــوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:**

**ســێ شت هەیە هەر کەسێ هەستێت بەئەنجام دانیان بەڕاستی ئەو کەسە لەزەت و شیرینایەتی ئیمانی چەشتووە:-**

**١- هەر کەسێ خوای گەورەو پەروەردگاری بەتاك و تەنهای بپەرستێ و بزانی خوایەکی تری بەحەق نیە بیجگە لە ئەو،**

---

٩- حديــث حســن صحيــح رواه البخــاري في الكبــير ٣١/٥ وابــو داود ١٥٧٩ والطبراني في الصغير ٥٥٥ وفي صحيح الجامع الصغير رقم ٣٤١ .



**٢- هەموو ســاڵێ زەکاتی ماڵەکەی دەربــکات بەدلێکی پاك و دوور لەڕیا دەرونی خۆی پێ پاك بکاتەوە، ئەوەی کە دەیدات لەزەکاتدا باپیر نەبــێ گەڕۆڵ نەبێ، نەخۆش نەبێ، ئایــەخ و خراپی ناو حەیوانەکان نەبــێ ، با لەناوەنــدی ماڵەکانتان بێ چونکە خــوای گەورە هەروەك داوای چاکترینــی لێ نەکــردون هەروەها فەرمانیشــی پێ نەکردوون بەدەرکردنی ئایەخ و خراپەکان،**

**٣- دڵ و دەرونی خۆی پاك بکاتەوە لەتاوان و خراپەکاری.**



## فەرموودەی (١٠)

سـێ شـت دەبنە هۆی تیاچوونی مرۆڤ و سێ شتیش دەبنە هۆی ڕزگاری:-

عَنِ ابْنِ عُمَرَ، (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ثَلاثٌ مُهْلِكَاتٌ، وَثَلاثٌ مُنَجِّيَاتٍ، وَثَلاثٌ كَفَّارَاتٌ، وَثَلاثٌ دَرَجَاتٌ. فَأَمَّا الْمُهْلِكَاتُ: فَشُحٌّ مُطَاعٌ، وَهَوًى مُتَّبَعٌ، وَإِعْجَابُ الْمَرْءِ بِنَفْسِهِ. وَأَمَّا الْمُنَجِّيَاتُ: فَالْعَدْلُ فِي الْغَضَبِ وَالرِّضَى، وَالْقَصْدُ فِي الْفَقْرِ وَالْغِنَى، وَخَشْيَةُ اللَّهِ فِي السِّرِّ وَالْعَلانِيَةِ. وَأَمَّا الْكَفَّارَاتُ: فَانْتِظَارُ الصَّلاةِ بَعْدَ الصَّلاةِ، وَإِسْبَاغُ الْوُضُوءِ فِي السَّبَرَاتِ، وَنَقْلُ الأَقْدَامِ إِلَى الْجَمَاعَاتِ. وَأَمَّا الدَّرَجَاتُ: فَإِطْعَامُ الطَّعَامِ، وَإِفْشَاءُ السَّلامِ، وَصَلاةٌ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ[١٠].

واتـا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوای گەورە لەخۆی و باوکی ڕازی بێ) ئەفەرموێ:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: سێ شت دەبنە هۆی تیاچوونی مرۆڤ، و سێ شتیش دەبنە هۆی ڕزگاری و سێ شتیش دەبنە هۆی سڕینەوەی تاوانەکان، و سێ شتیش پلە و پایەیی مرۆڤ بەرز دەکەنەوە.

ئەو سێ شتەی دەبنە هۆی تیاچوونی مرۆڤ:-

---

١٠- حديـث صحيـح رواه الطبرانـي في الاوسـط و أنظر صحيـع الجامع الصغير وزيادته للشيخ الالباني رحمه الله رقم ٤٥٨ .



١- ڕەزیلی و چاوچنۆك و تەماح باز ئەومالەی کە خوای گەورە پێ داوە بەشی هەژار و نەداری لێ دەرناکات.

٢- شوێن کەوتنی هەواو ئارەزوو.

٢- کەسێك خۆی بەلاوە موهیم و گرنگ بێ و لەخۆی ڕازی بێ.

وە ئەو سێ شتەی دەبنە هۆی رزگاری مرۆڤ:-

١- دادپەروەری لەکاتی تورەیی و ڕازی بوندا.

٢- مام ناوەندی ژیان لەکاتی دەوڵەمەندی و هەژاریدا.

٣- ترسان لەخوا لە ئاشکرا و نهێنیدا.

وە ئەو سێ شتە دەبنە هۆی سڕینەوەی تاوانەکان:-

١- چاوەروانی نوێژ لەدوای نوێژ.

٢- دەست نوێژ گرتن لەکاتی سارد و سەرمادا.

٣- زۆر هەنگاو نان بۆ نوێژی بەکۆمەڵ لەمزگەوتدا

وە ئەو سێ شتەی پلەی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە:-

١- نان دان بەهەژاران.

٢- زۆر سەلام کردن لەخەڵك.

٣- وە شەو نوێژکردن کاتێ خەڵك خەوتووە.

## فەرموودەی (١١)

سێ شت پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانی ئەنجامی بدات:-

عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ)، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّـهُ قَالَ: "ثَلَاثٌ حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ: الْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَيَمَسُّ مِنْ طِيبٍ إِنْ كَانَ"[١١].

واتـا یەکێـك لەهاوەڵە بەرێزەکانـی پێغەمبەر (رەزای خـوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

سێ شت هەیە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانی ئەنجامی بدات:-

١- خۆشوردنی ڕۆژی هەینی،

٢- سیواك کردن بەتایبەتی لەکاتی نوێژەکاندا،

٣- بۆنی خۆش لەخۆدان ئەگەر هەبوو.

١١- حديـث صحيح انظر صحيـح الجامع الصغير للشيـخ ناصرالدين الألباني رقم ٣٠٢٨ و في مصنف ابن ابى شيبه



## فەرموودەی (١٢)

**پێغەمبەر (ﷺ) سێ شتی دەکرد ئەمڕۆ خەڵکی وازیان لێ هێناوە:-**

جَاءَ أَبُو هُرَيْرَةَ، إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ، فَقَالَ : ثَلَاثٌ كَانَ رَسُولُ اللَّـهِ (ﷺ) يَعْمَلُ بِهِنَّ، تَرَكَهُنَّ النَّاسُ، كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي الصَّلَاةِ مَدًّا، وَيَسْكُتُ هُنَيَّةً، وَيُكَبِّرُ إِذَا سَجَدَ، وَإِذَا رَكَعَ[١٢].

**واتا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) هات بۆ مزگەوتی (بەنی زورەیق) فەرمووی:**

**پێغەمبەر (ﷺ) لەنوێژدا سێ شتی دەکرد بەڵام ئێستا خەڵکی وازیان لێ هێناوە.**

**١- ئەگەر دەستی بەنوێژ بکردایە هەر دوو دەستی بەدرێژای بەئەندازەی هەردوو شانی بەرزدەکردەوە،**

**٢- لەدوای (الله اكبر)ی نوێژ دابەستین پێش ئەوەی دەست بکات بەخوێندنی سورەتی (فاتیحا) وەستانێکی کەمی دەکرد ئینجا دەستی دەکرد بەقورئان خوێندن،**

**٣- کاتی دەرۆیشت بۆ کڕنۆش (سُجْدَ) (الله أكبر)ی دەکرد. وە بۆ چەمینەوە (ركع) (الله أكبر)ی دەکرد.**

---

١٢- حديث صحيح رواه البخاري ٢/ ٢٢٤ ومسلم ٢٩٢ وابو داود رقم ٧٤٦ وفى الموطأ ١/٧٦ .



## فەرموودەی (١٣)

سێ شت لە خورەوشتی پێغەمبەرایەتی یە:-

عــن أبي درداء (رضي الله عنه) قــال: قال رسول اللــه (ﷺ): ثلاث من أخلاق النبوة "تعجيل الإفطــار، وتأخير السحور، و وضع اليمنى على الشمال في الصلاة"[١٣].

ئەبوو دەرداء (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:

سێ شت لە خورەوشتی پێغەمبەرایەتییە:-

١- زوو بەربانگ کردنەوە،

٢- درەنگ پارشێوکردن،

٣- دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لەکاتی نوێژدا.

---

١٣- حديث حســن رواه الطبراني في الكبيرو انظر صحيح الجامع الصغير وزيادته ومجمع الزوائد ٢/١٠٥



## فەرموودەی (١٤)

**سێ شت ڕاســتیان بەڕاســت دەژمێرێ وە بەگاڵتە کردنیشیان هەر بەڕاست دەژمێرێ :-**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "ثَلَاثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ: النِّكَاحُ، وَالطَّلَاقُ، وَالرَّجْعَةُ"[١٤]. وفى رواية عن فضالة بن عبيد الأنصاري عن رسول الله (ﷺ) قال: "ثلاث لايجوز اللعب فيهن: الطلاق والنكاح و العتق"[١٥]

**واتــا ئەبو هوريرە (ڕەزای خوای لێ بــێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:**

**ســێ شت ڕاستیان بەڕاست دەژمێرێ وە بەگاڵتە کرد نیشیان هەر بەڕاست دەژمێرێ:-**

**١- ژن تەڵاقــدان، واتــە ئەگەر کەســێك بەگاڵتە و سوبعەتیشــەوە ژنەکەی تەڵاق بدات هەر تەڵاقی دەکەوێت.**

**٢- ژن مــارە بڕیــن بــۆ نموونە کەســێك بەگاڵتــەوە بڵێ کچەکــەم کردە خێزانت،نیکاحەکە دادەمەزرێت و دەبێت بە هاوسەری ئەو کەسە با بەگاڵتەشەوە بڵێ ئەوا کچەکەم یان خوشکەکەم کردە خێزانت یان نیکاحم کرد لێت.**

---

١٤- حديــث حسن صحيح سنن ابــي داود ١٩٠٤ و صحيح سنن ابن ماج ١٦٥٨ و صحيح سنن الترمذى ١٩٠٦

١٥- حديــث حسن رواه الطبراني فــى الكبير وفى فيض القديــر رقم ٣٤٨٠ وفي صحيح جامع الصغير رقم ٣٠٤٧.



٣- گەڕانەوەی ژن بۆ ژێر نیکاح و ڕکێفی خۆت واتە بەخێزانەکەت بڵێی وا تۆم هێنایەوە ژێر نیکاحی خۆم بەمەرجێ جیابونەوەی تەواو (بینــون الکبری) لەنیوانیاندا ڕوی نەدابــێ و لەو جۆرە تەڵاقانە بێ کەمەجالی چاك کردنەوەی تێدا مابێ، وعیدەی شەرعی بەسەرنەچوبێت.

واتە: فوضالەی کوڕی عوبەیدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وآله وسلم) فەرموویەتی:

ســێ شــت دروســت نییە بە گەمەو گاڵتەیان تێدا بکرێت، واتە بە گاڵتەشەوە بەکاربهێنرێن هەر بە ڕاست دەژمێردرێن:

١- ژن تەڵاقدان.

٢-مارەبڕینی ئافرەت بۆ کەسێك.

٣-ئازادکردنی بەندەو کۆیلە.



## فەرموودەی (١٥)

**سێ شت هەیە هەر موسڵمانێك ئەنجامیان بدات دڵی گەرد ناگرێت و دور دەبێ لەدەغەڵی و ناپاکی و نیفاق:**

عن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه)، عن النبي قال (ﷺ) قال: «ثلاث لا يغـل عليهن قلب المؤمـن: إخلاص العمل للـه، والنصيحة لولاة الأمر، ولزوم جماعتهم، فإن دعوتهم تحيط من ورائهم[١٦].

**واتـا ئەبو سـەعیدی خـودری (ڕەزای خوای لـێ بـێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:**

**سـێ شـت هەیە هەر مرۆڤێکی باوەڕدار هەستێت بەئەنجام دانیان دڵی گەرد ناگرێت و دوردەبێ لەدەغەڵی و دووڕوی و ناپاکی و نیفاق:-**

**١- دڵسـۆزی و خـۆ یـەك لای کردنەوە بـۆ خـوا لەکردەوەکاندا (الاخلاص) واتە هەرکار و کردەوەیەك کە دەیکەیت تەنها مەبەستت ڕەزامەندی خوای گەورە بێ و هیچی تر،**

**٢- ئامۆژگاری پیشەوایانی ئیسلام بە پێشنیارو بۆچونی باش،**

**٣- پەیوەست بوون و وابەستە بوون بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە.**

**چونکە: بانگەوازی موسڵمانان بۆ ڕێگای خوا موسڵمانان کۆدەکاتەوەو پارتەوازەییـان ناهێڵـێ وە هەرکەس بێتە ناو کۆمەڵی موسـڵمانانەوە ئـەو هاتنەناوەوە دەبێتـە هۆی کاروباربەسـت و ڕێگایەك لە بەردەم دوژمنانیاندا، بۆیە ناتوانن بە ئاسانی زەفەری پێ ببەن.**

---

١٦- حديث صحيح رواه البزار في كشف الأستار ١٤١ وقال هيثمی في مجمع الزوائد ١/١٣٧ رواه البزار و رجاله موثوقون و رواه ابن حبان فی صحيحه ٦٧٩



## فەرموودەی (١٦)

**سیَ شت قەدەغە كردنیان لەخەڵكی دروست نی یە:-**

عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ (رضي الله عنه)، أَنّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَـالَ: " ثَلَاثٌ لَا يُمْنَعْنَ: الْمَاءُ وَالْكَلَأُ وَالنَّارُ"[١٧].

وفي رواية الناس شركاء في ثلاث، الكَلاءُ والماءُ والنارُ[١٨].

**واتــا ئەبو هوریرە (رەزای خوای لێ بێ) ئەگێرێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:**

**ســیَ شت قەدەغەكردنیان لەخەڵكی دروست نیە وە هەموو خەڵكی هاوبەشن تیایاندا:-**

**١- ئاو**

**٢- لەوەڕگا (شوێنی حەیوان لەوەڕاندن)**

**٣- ئاگر**

**لە ڕیوایەتێكی تردا دەفەرموێت: خەڵكی هەموو هاوبەشن لە سیَ شتدا**

**١- لەوەڕگا**

**٢- لە ئاودا**

**٣- لەئاگردا**

---

١٧-حديث صحيح انظر صحيح الجامع رقم الحديث ٢٤٦٧ - وفي سنن ابن ماجه رقم ٢٤٧٣ وإسناده صحيح ورجاله موثقون.

١٨- حديث صحيح رواه ابوداود أنظر عون المعبود رقم ٣٤٧٤ وصحيح الجامع ٢٤٧٢.



## فەرموودەی (١٧)

سێ شت هەیە سوێندیان لەسەر ئەخۆم:-

عَـنْ عَائِشَـةَ (رضي الله عنها)، أَنَّ رَسُولَ اللـهِ (ﷺ) قَالَ: (ثَـلَاثٌ أَحْلِفُ عَلَيْهِـنَّ: لَا يَجْعَلُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ مَنْ لَهُ سَهْـمٌ فِي الْإِسْلَامِ كَمَنْ لَا سَهْمَ لَهُ، وَأَسْهُمُ الْإِسْلَامِ ثَلَاثَةٌ: الصَّلَاةُ، وَالصَّوْمُ، وَالزَّكَاةُ، وَلَا يَتَوَلَّى اللـهُ عَزَّ وَجَلَّ عَبْدًا فِي الدُّنْيَـا فَيُوَلِّيهِ غَيْرَهُ يَـوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا يُحِبُّ رَجُلٌ قَوْمًا إِلَّا جَعَلَهُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ مَعَهُمْ[١٩].

واتا عائیشــە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێرێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:

ســێ شت هەیە سوێندیان لەسەر دەخۆم: خوای گەورە ئەو کەسەی کە بەشــی هەیە لەئیسلامدا وەك ئەو کەسەی لێ ناکات کە بەشی نیە لە ئیسلامدا، وەئیسلام بریتییە لە سێ بەشی سەرەکی:

١- نوێژ،

٢- ڕۆژووە،

٣- زەکاتە.

---

١٩- ١) حديث صحيح رواه النسائي والبيهقي في شعب الايمان انظر صحيح الجامع الصغير رقم ٣٠٢١ ورواه احمد فى مسنده ٦/١٤٥ وقال الهيثمى في مجمع الزوائد ٣٧/١ رجال احمد رجال ثقات ورواه ابو يعلى ايضا رقم ٤٥٦٦



**وەهەر بەندەیەك لەدونیادا دۆستایەتی لەگەڵ هەرکەسێکدا بووبێ خــوای گەورە لــەڕۆژی دویدا بێجگە لەو کەســە لەگەڵ کەســی تردا حەشری ناکات**

**وەهــەر پیاوێــك هەر گەل و هۆز و کەســێکی خــۆش بوێت خوای گــەورە لەڕۆژی دوایدا لەگەڵ ئەوانــدا دای دەنێت و مامەڵەی لەگەڵدا دەکات.**

## فەرموودەی (١٨)

سیٚ شت هەیە نادرێنە دواوە :-

عن ابن عمر(رضي الله عنه) قال قال رسول الله (ﷺ) ثلاث لا ترد الوسائد والدهن واللبن[٢٠].

واتا عبدوڵلای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) ئەگێریٚتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:

سیٚ شت هەیە کە بۆیان هێنای نابێت بیان دەیتە دواوە بیان گێریتەوە:-

١- پشتی (سەرین) کە بۆیان هێنای پالیٚ پێوەبدەیت،

٢- بۆنی خۆش وەك ڕێحانە و عەتر و هەموو بونێکی خۆش.....

٣- شیر و ماست و (سپیایی حەیوان).

٢٠- حديث صحيح، انظر صحيح الترمذي رقم ٢٢٤١ وفي الجامع الاصول في الاحاديث الرسول رقم ٢٧١٩ وفى تحقه الاخوذى رقم ٢٧٩٠

## فەرموودەی (١٩)

**سێ کەس هەیە خوای گەورە لەڕۆژی دوایدا قسەیان لەگەڵدا ناکات:-**

عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قالَ: قال رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ):
(( ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ، وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ، شَيْخٌ زَانٍ، وَمَلِكٌ كَذَّابٌ، وَعَائِلٌ مُسْتَكْبِرٌ ))[٢١].

**واتـا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:**

**سێ جۆرە کەس هەیە خوای گەورە لەڕۆژی دوایدا قسەیان لەگەڵدا ناکات ، وە لە تاوان پاکیان ناکاتەوە وە سەیریشیان ناکات، وە سزایەکی زۆر سەخت و پڕ ئێشیان بۆ هەیە:-**

**١- پیری داوێن پیس (زینا کەر)،**

**٢- فەرمان ڕەوای زۆر درۆزن،**

**٣- هەژاری خۆبەگەورەزان و لوت بەرز.**

---

٢١- حديث صحيح رواه مسلم رقم ١٠٧



## فەرموودەی (٢٠)

**سێ کەسی تریش هەن خوای گەورە قسەیان لەگەڵدا ناکات:-**

عن أبي ذر(رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال ثلاثة لا يكلمهم الله يوم القيامة ولا ينظر إليهم ولا يزكيهم ولهم عذاب أليم قال فقرأها رسول الله صلى الله عليه وسلم ثلاث مرار قال أبو ذر خابوا وخسروا من هم يا رسول الله قال المسبل والمنان والمنفق سلعته بالحلف الكاذب[٢٢].

**ئەبو زەڕ (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:**

**سێ کەس هەن خوای گەورە لەڕۆژی دوایدا قسەیان لەگەڵدا ناکات، وەسەیریان ناکات، وەلەتاوان پاکیان ناکاتەوە، وە سزایەکی زۆر سەخت و پرئێشیان بۆ هەیە. ئەبو زەڕ (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی سێ جار دووبارە کردەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! زەرەرمەند بن و تیابچن ئەوانە کێن. فەرمووی:-**

**١- کەسێك دامێنی جل و بەرگی خۆی لەزەوی بخشێنێ بۆ فیز و دەعیە و دەمار و تەکەبوور،**

**٢- ئەو کەسەی منەت بکات و بنازێ بەو خێرو چاکەیەی کە دەیکات،**

**٣- ئەو کەسەی بەسوێندی درۆ شتومەك و کاڵای خۆی ساغ بکاتەوە.**

---

٢٢- حديث صحيح رواه مسلم رقم ١٠٦٠ وابو داود رقم ٢٠٨٧ والترمذى ١٢١١ وابن ماجه ٢٢٠٨



## فەرموودەی (٢١)

**سێ کەس هەن خوای گەورە بە چاوی میهرەبانی سەیریان ناکات:-**

عن أَبي هُرَيْـرَةَ، (رضي الله عنه) قال: قَالَ رَسُولُ اللَّــهِ (ﷺ): "ثَلاثَةٌ لا يَنْظُـرُ اللَّهُ إِلَيْهِـمْ يَوْمَ الْقِيَامَــةِ وَلا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَـذَابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ كَانَ لَهُ فَضْلُ مَــاءٍ بِالطَّرِيقِ فَمَنَعَهُ ابْنَ السَّبِيــلِ، وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا لا يُبَايِعُــهُ إِلا لِدُنْيَا فَإِنْ أَعْطَــاهُ مِنْهَا رَضِيَ وَإِنْ لَمْ يُعْطِهِ مِنْهَا سَخِطَ، وَرَجُلٌ أَقَــامَ سِلْعَتَهُ بَعْدَ الْعَصْرِ فَقَالَ: وَاللَّهِ الَّــذِي لا إِلَهَ إِلا هُوَ لَقَدْ أُعْطِيتَ كَذَا وَكَذَا، فَصَدَّقَهُ الرَّجُلُ، فَاشْتَرَاهَا مِنْهُ ثم قرأ هذه الاية" ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾[٢٣].

**واتـــا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**ســێ کەس هەن خوای گەورە لەڕۆژی دوایدا ســەیریان ناکات و لە تاوان پاکیان ناکاتەوە و سزایەکی سەخت و پرئێشیان بۆ هەیە:-**

**١- پیاوێــك ئاوێکی هەبێ لەڕیگایەکدا لەخۆی زیاد بێ و وەنەهێڵێ ڕێبوار لێی بخواتەوە،**

**٢- پیاوێك تەنیا لەبەر دوونیا پەیمان بدات بەپێشەوا کەی ئەگەر پارەو شــتومەکی دایە ئەوە لێی رازی یە ، وەئەگەر لێی گرتەوەو پێی**

---

٢٣- حدیث صحیح رواه البخــاری ٥/٢٥ ومسلم رقم ١٠٨ والترمذی رقم ١٥٩٥ وابن ماجه ٢٢٠٧



نەدات ئەوا رقی لێیەتی،

٣- پیاوێـــك لەدوای نوێژی عەصر شـــتومەکی دابنێ ئینجا بە درۆ بڵــێ : بەوخوایەی هیـــچ خوایەکی تر نیە غەیری خـــۆی ئەوەندە و ئەوەنـــدم پـــێ داوە ، کابراش بەم ســـوێندەی بڕوادەکات و شـــتەکەی لێ دەکڕێ پاشـــان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا ﴾

## فەرموودەی (٢٢)

سێ کەس نزا و پارانەوەکانیان نادرێتە دواوە:-

عن أبي هريرة -(رضي الله عنه)- قال: قال رسول الله (ﷺ): ثَلاَثَةٌ لَا يَرُدُّ الله دُعاءَهُمْ: الذَّاكِرُ الله كَثِيراً، والمَظْلُومُ، والإِمامُ المُقْسِطُ[٢٤].

واتـــا ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) وسلم فەرموویەتی:-

سێ کەس نزا و پارانەوەکانیان نادرێتە دواوە بێ گومان پارانەوەکانیان وەردەگیرێت:

١- کەســێك بەردەوام زیکر و یــادی خوای گەورە دەکات و زۆربەی کاتەکانی بەم جۆرە دەباتە سەر،

٢- کەسێکی ستەم لێ کراو داماو،

٣- پادشایەکی دادپەروەر.

## فەرموودەی (٢٣)

---

٢٤-رواه البيهقي في شعب الايمان و انظر صحيح الجامع الصغير رقم ٣٦٤.



**سێ جۆرە کەس هەن ناچنە بەهەشتەوە :-**

عـن أبي موسـى (رضي الله عنه) قال: قـال رسول اللـه (ﷺ): ثلاثة لا يدخلون الجنة مدمن الخمر، وقاطع الرحم، ومصدق بالسحر[٢٥].

**واتا: ئەبی موسـى (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**سێ کەس هەن ناچنە بەهەشتەوە:-**

**١- عەرەق خۆرێکی بەردەوام و وابەستە بوو بەعەرەقەوە،**

**٢- کەسـێك ڕشـتەی خزمایەتی بپچڕێنێت و سـەردانی خزمانی نەکات،**

**٣-کەسێك باوەڕ بە جادوو (سیحر) بکات.**

---

٢٥-حديـث صحيح رواه احمد ٣٩٩/٤ وابو يعلى ٧٢٤٨ ورجال احمد وابو يعلى رجال ثقات ورواه ابن حبان في صحيحه ٥٣٤٦ وفي فيض القدير رقم ٣٥٢٨



## فەرموودەی (٢٤)

سێ کەسی تریش هەن ناچنە بەهەشتەوە :-

عــن عبدالله ابن عمــر (رضي الله عنه) قال: قــال النبــي (ﷺ) ثلاثة لا يدخلون الجنة: العاق بوالديه، والديوث، ورجلة النساء"[٢٦].

واتــا عەبدوڵــلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بــێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

سێ کەس هەن ناچنە بەهەشتەوە:-

١- کەســێك لەگەڵ باوك دایكیدا باش نەبێت و قسەی ناشیرینیان پێ بڵێ و پییاندا هەڵ شاخێ.

٢- کەســێك بەلایەوە ئاسای بێت داوین پیسی لەگەڵ خێزان و کچ و خوشكیدا.... بکرێت.

٣- پیاوێك خۆی بشــوبهینێ بە ژن لەجل و بەرگ و قســەکردن و ڕۆیشتندا، یان بەپێچەوانەوە.

---

٢٦-حديــث حســن رواه النسائي في الكبرى ٢٣٤٣ والحاكــم ٧٢/١ و وصححه و وافقه الذهبي وفي صحيح الجامع الصغير رقم ٣٠٦٣.



## فەرموودەی (٢٥)

سێ کەس هەن مەلائیکەی ڕەحمەت نزیکیان نابیتەوە:-

عن ابــن عباس (رضي الله عنهما) قــال: قال رسول اللــه (ﷺ): "ثلاثة لا تقربهم الملائكة، السكــران، والمتضمخ بالخلوق، والجنب؛ إلا أن يتوضأ"[٢٧].

واتــا عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خوای لــێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

سێ کەس هەن مەلائیکەی ڕەحمەت نزیکیان نابێتەوە:-

١- ئەو کەسەی عارەق دەخواتەوە و سەرخۆشە،

٢- پیاوێك بۆنی ژنان لەخۆی بدات و ڕەفتار و هەڵســوکەوتی وەك ژنان وابێت.

٣- کەسێك لەش گران بێت (جَنَب) هەتا دەست نوێژ دەگرێت،

---

٢٧- حديث صحيح رواه البزار في كشف الاستار رقم ٢٩٣٠ ورجاله رجال صحيح وفي صحيح الجامع الصغير رقم ٣٠٦١.



## فەرموودەی(٢٦)

سـێ کەس هەن چاویان ئاگر نابینێت لە ڕۆژی دوایدا،واتە چاویان بە ئاگر ناسوتێ:

ثلاثـة لاترى أعينهـم النار يوم القيامة عين بكـت من خشية الله وعين حرست في سبيل الله وعين غضت عن محارم الله[٢٨].

واتا: سـێ کەس هـەن چاویان ئاگر نابینێت لـە ڕۆژی دوایدا،واتە چاویان بە ئاگر ناسوتێ:

١- چاوێك لەترسی خوا گریا بێت،

٢- چاوێك لەبەر خاتری خوا ئێشك گری و پاسەوانی گرتبێت،

٣- چاوێك تەماشایی قەدەغەکراوەکانی خوای نەکردبێت،

---

٢٨- حديث صحيح، أنظر أحاديث الصحيحة للشيخ الالباني رحمه الله رقم ٢٦٧٣



## فەرموودەی (٢٧)

**سێ کەس هەن پرسیاریان لێ ناکرێت و دەبرێن بۆ ئاگری دۆزەخ:-**

عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ (رضي الله عنه)، عَـنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: ثَلاثَةٌ لا تُسْأَلُ عَنْهُمْ: رَجُلٌ نَازَعَ اللَّـهَ رِدَاءَهُ، فَإِنَّ رِدَاءَهُ الْكِبْرُ، وَإِزَارَهُ الْعِـزَّةُ، وَرَجُـلٌ كَانَ فِي شَك مِـنْ أَمْرِ اللَّـهِ، وَالْقُنُوطُ مِـنْ رَحْمَةِ اللَّهِ"[٢٩].

**واتـــا فوضالە ی کوڕی عوبەیدوڵا (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**ســێ کەس پرسیاریان لێ ناکرێت و بەبێ لێ پرسینەوە دەبرێن بۆ ئاگری دۆزەخ :-**

**١- پیاوێك بیەوێ شـــکۆمەندی و گەورەی کە دوو پۆشاکی تایبەتی خـــوای گەورەن، بۆ خۆی دامالێت و مل ملانێ لەگەڵ خوا دابکات لەو بارەیەوە واتە خۆی بەگەورە و شکۆمەند بزانێت.**

**٢- پیاوێك گومانی هەبێ لەفەرمان و بڕیارەکانی خودا.**

**٣- کەســێك نـــا ئومێد بێــت لەڕەحم و ســۆز و میهرەبانی خوای گەورە.**

---

٢٩- حديــثٌ حسنٌ قال الهيثمــي في مجمع الزوائــد ٩٩/١ رواه الطبراني في الكبير هاكذا ورواه البزار رقم ٨٥ مطولا ورجاله ثقات و رواه ابن الحبان رقم ٤٥٥٩ .



## فەرموودەی (٢٨)

**سێ کەس نوێژەکانیان لەگوێچکەیان بەرز نابێتەوە:-**

عن أبي أمامة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): ثلاثة لا تجاوز صلاتهم آذانهم العبد الآبق حتى يرجع وامرأة باتت وزوجها عليها ساخط وإمام قوم وهم له كارهون[٣٠].

**واتــا ئەبی ئومامە (ڕەزای خوای لێ بـێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**سێ کەس نوێژەکانیان لەگوێچکەیان بەرز نابێتەوە:-**

**١- بەندەیــەك لە گەورەکــەی هەڵهاتبێت تا دەگەڕێتەوە بەمەرجێ ئاغاکەی زۆر و زوڵم و ستەمی لێ نەکردبێ،**

**٢- ئافرەتێك ڕۆژ بکاتەوە و مێردەکەی دڵ گران و توڕەبێت لێ ی،**

**٣- کەســێك پێش نوێژی بکات بۆ کۆمەڵێك و رقیان لێ ی بێت و حەز بەچارەی نەکەن.**

---

٣٠–حدیــث حسن رواه الترمذی رقم ٣٦٠ وفي صحیــح جامع الصغیر رقم ٣٠٥٧ وفي فیض القدیر رقم ٣٥١٧



## فەرموودەی (٢٩)

سێ کەس نزا و پاڕانەوەیان نادرێتە دواوە و ڕەت ناکرێتەوە :-

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قال: قَالَ رسول الله (ﷺ): "ثَلاثَةٌ لا تُرَدُّ دَعْوَتُهُمْ الإِمَامُ الْعَادِلُ وَالصَّائِمُ حِينَ يُفْطِرُ وَدَعْوَةُ الْمَظْلُوم يَرْفَعُهَا فَوْقَ الْغَمَام وَتُفَتَّحُ لَهَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَيَقُولُ الرَّبُّ عَزَّ وَجَلَّ وَعِزَّتِي لأَنْصُرَنَّكِ وَلَوْ بَعْدَ حِينٍ "[٣١].

واتـــا: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

سێ کەس نزاو پاڕانەوەیان ڕەت ناکرێتەوە و نادرێتە دواوە:-

١- فەرمان ڕەوای دادپەروەر،

٢- ڕۆژووەوان کاتێك بەربانگ دەکاتەوە،

٣- نـــزاو لاڵەی کەســـێکی زوڵم لێکراو خوای گـــەورە و پەروەردگار نزاکەی بۆ لای خۆی ســـەر هەور دەخات، وە دەرگاکانی ئاســـمانەکانی بۆ دەکاتەوە و خۆی پێ ی دەفەرموێ: بەگەورەی و شـــکۆمەندی خۆم قەســـەم سەرت دەخەم و دێم بەهاوارتەوە ئەگەر چی ماوەیەکیشی پێ بچێ.

---

٣١-حديث حسن رواه الترمذى ١٩١٢ -٢٥٥٦ وابن ماجه ١٧٥٢ واحمد ٢/٤٤٥ و ابن حبان ٢٤٠٨ و حسنه ابن حجر .



## فەرموودەی (٣٠)

**سێ کەس خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر خۆی یارمەتی یان بدات:-**

عـن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رســول الله (ﷺ): «ثلاثة حق على اللــه عَوْنُهُمْ: الْمُكَاتَبُ الذي يُرِيدُ الْأَدَاءَ، وَالْمتَزَوِّجُ الذي يُرِيدُ الْعَفَافَ، وَالْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[٣٢].

**واتـــا: ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**سێ کەس خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر خۆی یارمەتی یان بدات:-**

**١- ئەو بەندە نامە نوســەی کە دەیەوێت پارەی گەورەکەی بدات و خۆی ئازاد بکات،**

**٢- ئەو ژن خوازەش کە دەیەوێ ژن بهێنێ و بەپاکی خۆی ڕابگرێ، واتە مەبەســت لــە ژن هێنانەکــەی ئەوەیە کە بەداوێــن پاکی خۆی ڕابگرێ و توشی داوێن پیسی نەبێ، وەچەی باش بخاتەوە.**

**٣- ئــەو موجاهیــدەی کە لــە ڕێ ی خودا دەجەنگێ و مەبەســتی ســەرەکی بەرزکردنەوەی وشــەی خوای گەورەیە و بۆ ناو و شۆرەت و سەروەت و سامان ناجەنگێ.**

---

٣٢-حديــث صحيــح رواه الترمذى رقــم ١٦٥٥ وفي صحيح الجامــع الصغير رقم ٣٠٥٠ والنسائي ٦/١٦ رقم ٢٥١٨



## فەرموودەی (٣١)

**سێ کەس خوای گەورە ئەیان پارێزێ و سەرپەرشتیاریانە:-**

عَـنْ أَبِي أُمَامَةَ (رضي الله عنه)، أَنّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: " ثَلاثَةٌ كُلُّهُمْ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ، إِنْ عَاشَ رُزِقَ وَكُفِيَ، وَإِنْ مَاتَ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ: مَـنْ دَخَلَ بَيْتَهُ فَسَلَّمَ، فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ خَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَهُوَ ضَامِـنٌ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ خَـرَجَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَهُـوَ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ "(٣٣).

**واتـا ئەبو ئومامە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**سێ کەس هەن خوای گەورە ئەیان پارێزێ و لەئەمانی ئەودان، ئەگەر ژیان خوای گەورە ڕزقیان ئەدات و سەروبەر ئەیان ژێنێ، وە ئەگەر مردیشن ئەیان خاتە بەهەشتەوە:-**

**١-هەر کەسێك بڕواتەوە بۆ ماڵی خۆی و سەلام بکات لەماڵ و منداڵی،**

**٢-هەر کەسێك بڕوات بۆ مزگەوت بەمەبەستی بەندایەتی و نوێژ کردن بۆ خوای گەورەو پەروەردگار،**

**٣-هەر کەسێك لەماڵ دەربچێت بڕوات بۆ جیهاد و غەزاکردن لەپێناوی خوا، بەمەبەستی ڕەزامەندی خوای گەورە.**

٣٣- (١) حديث صحيح رواه ابو داود ٢٤٩٤ وابن حبان في صحيحه ٤٩٩



## فەرموودەی (٣٢)

**سوێندتان لەسەر سێ شت بۆ ئەخۆم:-**

عَنْ أبي كَبْشَةَ الْأَنْمَارِيّ (رضي الله عنه): أَنّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللّهِ (ﷺ) يَقُولُ: «ثَلَاثَةٌ أُقْسِمُ عَلَيْهِنّ وَأُحَدّثُكُمْ حَدِيثًا فَاحْفَظُوهُ قَالَ: مَا نَقَصَ مَالُ عَبْدٍ مِنْ صَدَقَةٍ، وَلَا ظُلِمَ عَبْدٌ مَظْلَمَةً فَصَبَرَ عَلَيْهَا إِلّا زَادَهُ اللّهُ عِزًّا، وَلَا فَتَحَ عَبْدٌ بَابَ مَسْأَلَةٍ إِلّا فَتَحَ اللّهُ عَلَيْهِ بَابَ فَقْرٍ[٣٤].

**واتا ئەبی کەبشەی ئەنماری (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەفەرموێ: گوێم لێ بووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**سوێندتان لەسەر سێ شت بۆ ئەخۆم، وە ئەم قسەیەی کە بۆتانی دەکەم لەم بارەیەوە لە بەری بکەن:-**

**١-سەروەت و سامان و ماڵ خێری لێ بکرێ کەم ناکات،**

**٢-وە هەر بەندەیەك زوڵم و ستەمی لێ بکرێ ئەویش ئارام بگرێ لەبەر دەم ستەمەکەدا خوای گەورە سەربەرزی دوونیا و دوا ڕۆژی دەداتێ،**

**٣-وەهەر بەندەیەك دەرگای سواڵ لەخۆی بکاتەوە خوای گەورە دەرگای هەژاری لێ دەکاتەوە،**

---

٣٤- حدیث حسن صحیح رواه الترمذی ٢٣٢٦ وابن ماجه ٤٢٢٨ وأخرجه احمد ٤/٢٣٠



## فەرموودەی (٣٣)

سێ کەس هەن دوو پاداشتیان بۆ هەیە:-

عَن أَبِي موسى الاشعري (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رسول الله (ﷺ): (ثَلاثَةٌ لَهُمْ أجْرَانِ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ، وَآمَنَ بِمُحَمّد، وَالعَبْدُ المَمْلُوكُ إذَا أدّى حَقّ الله، وَحَقّ مَوَالِيه، وَرَجُلٌ كَانَتْ لَهُ أَمَةٌ فَأدّبَهَا فَأَحْسَنَ تَأدِيبَهَا، وَعَلّمَهَا فَأَحْسَنَ تَعْلِيمَهَا، ثُمّ أعْتَقَهَا فتَزَوّجَها، فَلَهُ أَجْرَانِ)[٣٥].

واتا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

سێ کەس دوو پاداشتیان بۆ هەیە:-

١- پیاوێك لە (اهل الكتاب) باوەڕ بێنێ بە پێغەمبەرەکەی خۆی و پاشان باوەڕ بهێنێت بە موحەمەد (ﷺ)،

٢- بەندەیەك مافی خوای گەورە و پەروەردگار بەجێ بهێنێ لەگەل مافی گەورەی خۆیدا،

٣- پیاوێك کە نیزەکیکی لابێ پەروەردەی بکات بە پەروەردەیەکی باش، وە فێری زانیاری بکات بە زانیاریەکی باش، پاشان ئازادی بکات و مارەی بکات دووپاداشتی بۆ هەیە.

---

٣٥- حديث صحيح متفق عليه رواه البخارى ١/١٧٠ ومسلم ١٥٤



## فەرموودەی (٣٤)

**سێ کەس هەن من لەڕۆژی دوایدا دوژمنایەتیان لەگەڵدا دەکەم:-**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال قال الله تعالى: ثَلَاثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا فَأَكَلَ ثَمَنَهُ وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيرًا فَاسْتَوْفَى مِنْهُ وَلَمْ يُوفِهِ أَجْرَهُ[٣٦].

**واتا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا فەرموویەتی:-**

**سێ کەس هەن لەڕۆژی دوایدا من ڕقم لێ یانە و دوژمنایەتی یان لەگەڵدا دەکەم، خۆم داواکارم لە سەریان:**

**١- پیاوێك بەهۆی منەوە پەیمان و بەڵێن دەدات بەکەسێك و هێمنی دەکاتەوە لەپاشان پەیمانەکەی ناباتە سەرو ناپاك دەردەچێ،**

**٢- پیاوێك مرۆڤێکی ئازاد بفرۆشێ و پارەکەی بخوات،**

**٣- پیاوێك کرێ کارێ بەکرێ بگرێ و کاری خۆی پێ ئەنجام بدات پاشان پارەکەی نەداتێ.**

---

٣٦-حديث صحيح رواه البخارى ٤/٣٤٦ / و احمد ٢/٣٥٨ و ابن ماجه رقم ٢٤٤٢ وابن حبان رقم ٧٣٣٩ .



## فەرموودەی (٣٥)

**سێ کەس بەڕاستی خوای گەورە بەهەشتی لەسەر قەدەغەکردوون:-**

عـن ابْنُ عُمَـرَ (رضي الله عنهما) أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ)، قَالَ: "ثَلاثَـةٌ قَدْ حَرَّمَ اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِـمُ الْجَنَّةُ: مُدْمِنُ الْخَمْرِ، وَالْعَـاقُّ، وَالدَّيُّوثُ، وَالدَّيُّوثُ الَّذِي يُقِرُّ فِي أَهْلِهِ الْخَبَثَ"(٣٧).

واتـا عبدوڵـلای کوڕی عومەر (ڕەزای خوا لەخـۆی و باوکی بێت) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

سـێ کـەس هـەن بەڕاسـتی خـوای گـەورە بەهەشـتی لەسـەر قەدەغەکردون:-

١- کەسێك لەسـەر عەرەق خواردنەوە بەردەوام بێت و بەوحاڵەوە بمرێت،

٢- کەسـێك لەگـەل بـاوك و دایکیدا باش نەبێـت و پێیاندا هەڵ شاخێ و قسەی ناشیرینیان پێ بڵێ،

٣- پیاوێك ئەوەندە بێ غیرەت بێ بەلایەوە ئاسایی بێ داوێن پیسی (زینا) لەگەل ژن و دایك و خوشك و کچ یدا بکرێت.

---

٣٧- حدیث صحیح رواه النسائی ٥/٨٠ و احمد ٢/٦٩ و الحاکم و صححه و وافقه الذهبي ١/٧٢ وفي صحیح الجامع الصغیر ٣٠٥٢



## فەرموودەی (٣٦)

**سێ کەس هەن داوا لەخوا دەکەن داوا کەیان وەرناگیرێت :-**

عن أبي موسى الأشعري (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): "ثلاثة يدعون الله، فلا يستجاب لهم: رجل كانت له امرأة سيئة الخلق فلم يطلقها، ورجل كان له على رجلٍ مال فلم يشهد عليه، ورجل أعطى سفيهاً ماله، وقد قال الله تعالى: (وَلا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ)[٣٨].

**واتا ئەبی موسی (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**سێ کەس هەن داوا لەخوای گەورە و پەروەردگار دەکەن خوای گەورە داواکەیان وەرناگرێت:-**

**١- پیاوێك ئافرەتێکی بەدرەوشت و خراپی لەژێر دەستدایە و تەڵاقی نادات،**

**٢- پیاوێك ماڵی لای کابرایەکە و شایەتی لەسەر نەگرتووە،**

**٣- پیاوێك سەروەت و سامان و ماڵی خۆی بدات بە کەسێکی گێل و کەم ئەقل لەگەل ئەوەشدا خوای گەورە فەرموویەتی** ﴿وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ﴾

٣٨-حديث صحيح رواه الحاكم و انظر صحيح الجامع الصغير للالبانى رقم ٣٠٧٥ وفي فيض القدير رقم ٣٥٠٧ .



## فەرموودەی (٣٧)

**سێ کەس قەڵەمی تاوان نوسینیان لەسەر هەڵ گیراوە:-**

عـن عـائشــة (رضي الله عنها) ما قال: قــال رسول اللــه (ﷺ): رفع القلم عن ثلاثة: عن النائم حتــى يستيقظ، وعن الصبي حتى يحتلم، وعن المجنون حتى يعقل[٣٩].

**واتـــا عائیشـــە (ڕەزای خـــوا لە خـــۆی باوکی بـــێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**سێ کەس قەڵەمی تاوان نوسینیان لەسەر هەڵ گیراوە واتە تاوانیان لەسەر نانوسرێت:**

**١- خەوتو تا خەبەری دەبێتەوە،**

**٢- منداڵ تا باڵغ دەبێ،**

**٣- شێت تا ئەوکاتەی ژیر دەبێتەوە و ئەقڵی دێتەوە سەر خۆی.**

---

٣٩-حديث صحيح رواه ابو داود رقم ٤٣٩٨ والترمذى رقم ١٤٢٣ وابن ماجه ٢٠٤١ والنسائى ٤/٣٢



## فەرموودەی (٣٨)

**سواڵ کردن تەنها بۆ سێ کەس ڕەوایە:-**

عن قبيصة بن مخــارق الهلالي (رضي الله عنه) قال تحملت حمالة فأتيت رسول الله (ﷺ) أسأله فيها فقال أقم حتى تأتينا الصدقة فنأمر لك بها قال ثــم قال يا قبيصة إن المسألة لا تحــل إلا لأحد ثلاثة رجل تحمل حمالة فحلت له المسألة حتى يصيبها ثم يمسك ورجل أصابته جائحــة اجتاحت ماله فحلت له المسألة حتى يصيب قواما من عيش أو قــال سدادا من عيش ورجل أصابته فاقــة حتى يقوم ثلاثة من ذوي الحجــا من قومه لقد أصابت فلانا فاقة فحلت له المسألة حتى يصيــب قواما مــن عيش أو قال ســدادا من عيش فمــا سواهن من المسألة يا قبيصة سحتا يأكلها صاحبها سحتا(٤٠).

**واتــا قوبەیصەی موخاریقی هیلالی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: بارویەکم گرتە ئەســتۆی خۆم چومــە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) داوای یارمەتیم لێکرد،**

**فەرمووی: بمێنەرەوە تا زەکاتمان بۆدێ ئەوســا بەشت ئەدەم ئینجا فەرمووی:-**

**ئەی قوبەیصە ســواڵ کردن و داوای پــارە لەخەڵك کردن تەنها بۆ یەکێ لەم سێ کەسە دروستە.**

**١- پیاوێك چوبێتە ژێر ئەندازەیەك ماڵ بۆ کوژاندنەوەی ئاژاوەیەك**

---

٤٠- ١) حديث صحيح رواه مسلم رقم ١٠٤٤ و أبو داود ١٦٤٠ و النسائي ٩٦/٥



بۆی دروســـتە داوا بــكات تا ئەو ئەندازە ماڵە كۆبكاتەوە  پاشـــان واز بێنێ.

٢-پیاوێـــك تەنگاوییەكی بەســـەردا هاتبێت ماڵەكـــەی تیا چوبێ و هەژار كەوتبێ ئەمەش بۆی دروســـتە داوا بكات تا ئەوەندە كۆبكاتەوە گوزەرانی بڕوا بەرێوە، یان فەرمووی: تا گوزەرانی پێ دەكا،

٣-پیاوێكیش هەژار كەوتبێ ســـێ كەســـی باش و وریا لەقەومەكەی خۆی شایەتی بۆ بدەن كەوا توشی هەژاری بووە ، ئەمەش بۆی دروستە داوا بكات تا ئەوندە كۆبكاتەوە گوزەرانی پێ دەڕوا بەرێوە بێجگە لەم سێ كەسە ئەی قوبەیصە! ئەوەی داوای سواڵ بكات حەرامە وە ئەوەی دەی خوات بە حەرامی دەیخوات.



## فەرموودەی (٣٩)

**سێ شت چارە سەر و شیفای تێدایە :-**

عن ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ: قال رسول الله (صلى الله عليه وآله وسلم):

الشِّفَــاءُ في ثَلَاثَةٍ شَرْبَةِ عَسَــلٍ وَشَرْطَةِ مِحْجَمٍ وَكَيَّــةِ نَارٍ وَأَنْهَى أُمَّتِي عَنْ الْكَيِّ[٤١].

**واتــا عبدوڵــڵای کوڕی عەبــاس(ڕەزای خــوا لەخــۆی باوکی بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وآله وسلم) فەرموویەتی:-**

**شیفا و چارەسەری نەخۆش لەسێ شت دایە :-**

**١- لەشیلەی هەنگویندا،**

**٢- لە کەڵە شاخ گرتندا،**

**٣- لە داخ کردندا، بەڵام بەرگری ئوممەتەکەم دەکەم لە داخ کردن.**

---

٤١- حديث صحيح رواه البخاري انظر الفتح الباري رقم ٥٦٨١.



## فەرموودەی (٤٠)

سێ جۆر خەو بینین هەیە :-

عـن أبي هريـرة (رضي الله عنه) قال: قـال رسول اللــه (ﷺ): (الرؤيا ثلاثٌ فالرؤيا الصالحة بشرى من الله، ورؤيا تحزين من الشيطان ورؤيـا مما يحدث نفس، فإن رأى أحد مـا يكره فليقم فليصل ولا يحدث به الناس[٤٢].

واتـا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

سێ جۆر خەو بینین هەیە:-

١- خەوبینینێکـی بـاش موژدەیەکـە لەلایەن پـەروەردگارەوە بۆ مرۆڤی خاوەن باوەڕ،

٢- خەوبینینێکی ناخۆش و دڵ گران کەر کە لەلایەن شەیتانەوەیە بۆ دڵ گران کردنی باوەڕدارە،

٣- خەو بینینێکی تر ئەوەیە کە مرۆڤ زۆر بیر لە شت دەکاتەوە و بەو خەیاڵەوە دەخەوێ و شـەو دێتەوە خەوی ئەگەر یەکێ لە ئێوە خەوێکی لەو جۆرە ناخۆشی بینی باهەڵسێ و نوێژ بکات، وە بۆ کەسی نەگێرێتەوە نە دۆست و نە دوژمن.

---

٤٢-حديث صحيح: رواه البخاری ١٢/٤٢٢ ومسلم ٤/١٧٧٣ وابو داود ٢/٧٢٣ والترمذی رقم ٢٢٩١

## فەرموودەی (٤١)

سێ شت بەو قومی و شومیان تێدایە :-

عـن عبدالله بن عمـر (رضي الله عنهما)ما قال: سمعت النبـي (ﷺ) يقول:
"إنما الشؤم في ثلاثة: المرأة والفرس والدار[٤٣].

واتـا عبدوڵلای کـوڕی عومەر (ڕەزای خوا لەخـوٚی و باوکی بێ) فەرمویەتی بیستوومە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:- خراپی و بەو قومی و شومی تەنها لەسێ شتدایە:-

١- لەئەسـپدایە ئەو ئەسـپە غەزای لەسـەر نەکرێ یان سەر شێت بێت و تەمەڵ و تەوەزەل بێ لەڕۆیشتندا وە هەمووکات شل و نەخۆش بێت وە خاوەنەکەی بەهیچ شێوازێك خێری لێ نابینێ.

٢- ئافرەتێکـی خـراپ و بەدرەوشـت و زمان درێژ بۆ سـەر مێردەکەی سەرپێچی کەر لەفەرمانی مێردەکەی بەهیچ شتێك دانەکەوتوو (غير القانعه)،

٣- خانو بەرەو ماڵێکی تەنگ و خراپ، دوور لە مزگەوت، و خاوەن دراوسێی خراپ.

......................................

تێبینی/ خودی ئەسپ و ئافرەت و خانوو هیچیان بە دەست نیە لە سـوود و زیان گەیاندن، بەڵام ئەو سیفەتە خراپانەی کە باسمان کرد وایان کردووە کە شووم بن.

## فەرموودەی (٤٢)

---

٤٣- رواة البخاری رقم ٢٨٥٨ و أخرجة مسلم ١٤/١٤



سێ کەس بۆیان هەیە زەوی دابچێنن و کشتوکاڵ بکەن :-

عَـنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رضي الله عنه)، قَالَ: قَـالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وآله وسلم): "إِنَّمَا يَزْرَعُ ثَلاثَةٌ، رَجُلٌ لَـهُ أَرْضٌ فَهُوَ يَزْرَعُهَا، وَرَجُلٌ مُنِحَ أَرْضًا فَهُوَ يَزْرَعُ مَا مُنِحَ، وَرَجُلٌ اسْتَكْرَى أَرْضًا بِذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ"[٤٤].

واتـا رافیـع (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لـە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وآله وسلم) فەرموویەتی:-

تەنها سێ کەس بۆیان هەیە کشتوکاڵ بکەن و زەوی دابچێنن:-

١- پیاوێ خۆی زەوی هەبێ و دای بچێنێ و بیکات بە کشتوکاڵ،

٢- پیـاوێ زەویەکی پێ بدرێ بـۆ خۆی و دای بچێنی و بیکات بە کشتوکال،

٣- پیاوێکیـش زەوییەك بەئاڵتون یان زیو بەکرێ بگرێ و بۆخۆی دایبچینێ و بیکات بە کشتوکاڵ.

---

٤٤- حدیـث صحیح رواه ابـو داود ٣٤٠٠ انظر سنن ابـی داود و صحیح سنن ابن ماجه رقم ١٩٨٢ وفي صحيح الجامع الصغير ٢٣٨٢



## فەرموودەی (٤٣)

**هەموو ئیش و کارەکان لەسێ شتدا کورت هەڵ هاتون:-**

عــن ابن عباس (رضي الله عنهما)، عن النبي (ﷺ) أن عيسى ابن مريم – عليه السلام – قــال: إنما الأمور ثلاثة: أمر تبين لك رشده فاتبعه، وأمر تبين لك غيه فاجتنبه، وأمر اختلف فيه فرده إلى عالمِ(٤٥).

**واتــا عەبدوڵڵای کــوڕی عەباس(ڕەزای خوا لەخــۆی و باوکی بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**عیسی پێغەمبەر(عليه السلام) فەرموویەتی:-**

**هەموو ئیش و کارەکان لەسێ شتدا کورت هەڵ هاتوون:-**

**١- ئیش و کارێ بۆت ڕۆشن بۆتەوە و دەزانی باشە،ئەوا بەبێ گومان و، دوودڵی بیکە،**

**٢- کارو فەرمانێك بۆت ڕۆشن بۆتەوە و دەزانی خراپە،ئەوا خۆتی لێ دوربگرەو توخنی مەکەوە،**

**٣- فەرمانێك بۆت ڕۆشن نەبۆتەوە و نازانی باشە یان خراپە،ئەمەیان بیگەڕێنەوە بۆ لای زانایەك تا ڕاستی مەسەلەکەت بۆ دەربخات.**

---

٤٥- حديــث حسن قال الهيثمي في مجمع الزوائــد ١/١٥٧ رواه الطبراني في الكبير ورجاله موثوقون قال المنذري بأسناد لابأس به



## فەرموودەی (٤٤)

دادوەر و قازییەکان سێ جۆرن :-

عن بريدة (رضي الله عنه) عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): القضاة ثلاثة: اثنــان في النار وواحد في الجنة، رجــل عرف الحق فقضى به فهو في الجنــة، ورجل عرف الحــق فلم يقض به وجــار في الحكم فهو في النــار، ورجل لم يعرف الحق فقضــى للناس على جهل فهو في النار[٤٦].

واتــا بورەیدە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

دادوەرو قازییــەکان ســێ جۆرن دوانیان لەئاگــری دۆزەخدان ، وە دانەیەکیان وا لەبەهەشتدا:-

١- پیاوێــك حــەق ئەزانــێ‌و دادوەری پــێ دەکات لەکاتی فەرمان ڕەوایدا ئەوە لەبەهەشتدایە،

٢- پیاوێك ڕاســتی و حەق دەزانێ‌بــەڵام کاری پێناکات وە لەگەڵ ئەوەشدا بەزوڵم و ستەم دادوەری دەکات بۆ خەڵکی ئەویش لەئاگردایە،

٣-وە پیاوێــك نازانێ هەق کامەیە‌و بە نەزانی دادوەری دەکات بۆ خەڵکی ئەوە لەئاگردایە.

---

٤٦- حديث صحيح رواه ابو داود ٣٥٧٣ والترمذى رقم ١٣٢٢ وفي صحيح الجامع الصغير وزياته للالبانى رقم ٤٤٤٦ .



## فەرموودەی (٤٥)

**فەڕو و بەرەکەت لەسێ شتدایە :-**

عَـنْ سَلْمَانَ الفارسي (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وآله وسلم)َ: الْبَرَكَةُ فِي ثَلَاثَةٍ: فِي الْجَمَاعَةِ، وَالثَّرِيدِ، وَالسُّحُورِ(٤٧).

**واتا سەلمانی فارس (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وآله وسلم) فەرموویەتی:-**

**فەڕو و بەرەکەت لەسێ شتدایە:-**

**١- لەکۆڕ و کۆمەڵێ موسڵمانانداو،**

**٢- لەتریت و تشریبدا،**

**٣- لەپارشێ و کردن و نان خواردن تێیدا.**

٤٧-حديث حسن قال الهيثمى في مجمع الزوائد رواه الطبرانى في الكبير ٣/١٥ وفي صحيح الجامع الصغير للشيخ ألا لباني رقم ٢٨٨٢ وفي فيض القدير رقم ٣٢٠٢.

## فەرموودەی (٤٦)

**ملێکی ئاگرین لە دۆزەخ ســەردەێنێتەدەر بۆ ناو مەحشــەر دەلێت خــوای گــەورە فەرمانی کردووە بەمن ســێ کۆمەڵ لەئێــوە ڕاپێچ و بەلکێشی جەهەنم بکەم :-**

عَنْ أَبِــي هُرَيْرَةَ(رضي الله عنه)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): يَخْرُجُ عُنُقٌ مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لَهُ عَيْنَــانِ يُبْصِرُ بِهِمَا، وَأُذُنَانِ يَسْمَعُ بِهِمَا، وَلِسَــانٌ يَنْطِقُ بِهِ، فَيَقُولُ: إِنِّي وُكِّلْــتُ بِثَلَاثَةٍ: بِكُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ، وَبِكُلِّ مَنِ ادَّعَى مَعَ اللهِ إِلَهًا آخَرَ، وَالْمُصَوِّرِينَ[٤٨].

**واتــە: ئەبــو ســەعیدی خــودری (ڕەزای خوای لــێ بــێ) ئەگێڕێتەوە لــە پێغەمبــەرەوە (ﷺ) فەرموویەتــی: ملێکــی ئاگرین لــە دۆزەخ سەردێنێتەدەر بۆ ناو مەحشەر دووچاوی هەیە پێ ی دەبینێت و دوو گوێ ی هەیە پێ ی دەبیســتێت،وە زمانێکی هەیە قســەی پێدەکات،و بەرامبــەر خەڵکەکە دەڵێت : خوای گەورە فەرمانی بەمن کردووە کە سێ کۆمەڵ لە ئێوە ڕاپێچ و بەلکێشی جەهەنم بکەم:-**

**١- هەموو فەرمان ڕەوایەکی یاخی بوو و ستەم کار،**

**٢- ئەو کەسانەی هاواریان لەغەیری خوا کردووە و پەرستویانە،**

**٣- ئەو کەسانەی کە وێنەیان کیشاوە و دروستیان کردووە.**

---

٤٨- أخرجه أحمد ٢/٣٣٦ برقــم ٨٢٢٥ والترمذى ٢٥٧٤ وصححه شيخ الالبانى في صحيح الترمذى ٢٠٨٣ وفى سلسلة الصحيحة ٥١٢ - ٢٦٩٩ وفي صحيح الجامع ٧٩١٥.



## فەرموودەی (٤٧)

**بەهەشت تامەزرۆی سێ کەسە بچێتە ناوییەوە :-**

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): «إِنَّ الْجَنَّةَ لَتَشْتَاقُ إِلَى ثَلَاثَةٍ: عَلِي، وَعَمَّارٍ، وَسَلْمَانَ»[٤٩].

**واتا ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**بەهەشت تامەزرۆی سێ کەسە بچیتە ناوییەوە:-**

**١- عەلی کوڕی ئەبی طالب،**

**٢- عەممارى کوڕی یاسر،**

**٣- سەلمانی فارسی.**

---

٤٩- حديث حسن رواه الترمذى رقم ٣٨٠٦ و صححه الحاكم في معرفة الصحابة ٤٦٦٦/٣ وفي صحيح الجامع الصغير رقم ١٥٩٨ .



## فەرموودەی (٤٨)

**خوای گەورە ڕق و تورەی زۆری لەسێ کەسە:-**

عَـنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما)ما أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: أَبْغَضُ النَّاسِ إِلَى اللَّــهِ ثَلَاثَةٌ مُلْحِدٌ فِي الْحَرَمِ وَمُبْتَــغٍ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ وَمُطَّلِبُ دَمِ امْرِئٍ بِغَيْرِ حَق لِيُهَرِيقَ دَمَهُ[٥٠].

**واتـــا عەبدوڵـــڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خـــوا لەخۆی و باوکی بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**خوای گەورە و پەروەردگار ڕق و تورەی هەرەزۆری لەسێ کەسە:-**

**١- خراپە کاری ناو حەرەمی مەکە،**

**٢- کەســێك لەئیســلامەتیدا بــەدوای نەریــت و باوی ســەردەمی نەفامیدا بڕوات،**

**٣- کەسێك بەشوێن بیانویەکدا بگەڕێ،بۆ ئەوەی بەناهەق و ناڕەوا خوێنی کەسێکی تر بڕێژێ.**

---

٥٠–حديــث صحيح رواه البخاری رقم ٦٦٨٢ واحمد ٣٥١/٤ والطبرانی في الكبير ٤٩٨ .



## فەرموودەی (٤٩)

سێ کەس وەفدی خوای گەورە و پەروەردگارن:-

عـــنِ أبي هريرة (رضي الله عنه) قـــال: قال رسول اللـــه (ﷺ): وفد الله ثلاثة، الحاجّ، والمُعتمِرُ، والغازِي[٥١].

واتـــا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

سێ کەس وەفدی خوای گەورە و پەروەردگارن:-

١- ئـــەو کەســـەی ئەڕوات بـــۆ ســـەردانی ماڵی خوا بە مەبەســـتی بەجیهێنانی فەرزیەتی حەج،

٢- ئەو کەسەی ئەڕوات بۆ عەمرەکردن،

٣- ئەو کەســـەی ئەڕوات بۆ جیهاد و غەزاکردن لەپێناوی خوادا وە مەبەستی سەرەکی تەنها ڕەزامەندی خوایە.

---

٥١-حديث صحيح رواه النسائی ١١٣/٥ وفي صحيح سنن ابن ماجه ٢٣٣٩ .

## فەرموودەی (٥٠)

سێ جۆر دەست هەیە :-

عن مَالِك بْنِ نَضْلَةَ (رضي الله عنه)، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "الأَيْدِي ثَلاثَةٌ: فَيَدُ اللَّهِ الْعُلْيَا، وَيَدُ الْمُعْطِي الَّتِي تَلِيهَا، وَيَدُ السَّائِلِ السُّفْلَى، وَأَعْطِ الْفَضْلَ وَلا تُعْجِزْ نَفْسَكَ"(٥٢).

واتـا مالیکـی کوڕی نەضلـە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

سێ جۆر و شێواز دەست هەیە:-

١- دەسـتی خوای گـەورە و پەروەردگار کە دەسـتی هەرە بەرز و بڵندە،

٢- دەستی بەخشندە و خێرکەر کەلەدوای دەستی خوای گەورە دێ،

٣- دەسـتی داواکەر و سـواڵ کەر کە دەستی هەرەژێرەوەیە، ئەوەی لەخاوخێزانـت زیادە لەرێگەی خوادا بیبەخشـە بەهـەژار و نەدار، و لەهەژاری مەترسە وە بەگوێ ی نەفست مەکە کاتێ دەلێ مەی بەخشە.

---

٥٢- ١) حديـث صحيح رواه ابو داود ١٤٦٩ وابن حبان ٨٠٩ وفي صحيح الجامع الصغير رقم ٢٧٩٤ .



## فەرموودەی (٥١)

سێ کەس هەن ئەهلی بەهەشتن :-

عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ الْمُجَاشِعِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ: سمعت رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ أَهْلُ الْجَنَّةِ ثَلاثَةٌ: ذُو سُلْطَانٍ مُقْسِطٌ مُتَصَدِّقٌ مُوَفَّقٌ، وَرَجُلٌ رَحِيمٌ رَقِيقُ الْقَلْبِ لِكُلِّ ذِي قُرْبَى وَمُسْلِمٍ، وَعَفِيفٌ مُتَعَفِّفٌ ذُو عِيَالٍ[٥٣].

واتا عیاض (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی : گوێم لێ بووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:-

سێ کەس و خەڵك هەن ئەهلی بەهەشتن:-

١- خاوەن دەسەڵاتێکی دادپەروەر تەوفیق دراو،

٢- پیاوێکی دڵ نەرم و بەبەزەی بۆ خزم و کەس و کاری خۆی بۆ هەموو موسڵمانی،

٣- پیاوێکی خاوێن و خۆ پاك ڕاگر، ماڵ و منداڵێکی زۆری کەوتبێ بەسەردا لەگەڵ ئەوەشدا پەنا نەبات بۆ لوقمەی حەرام و سواڵ کردن و کاری ناڕەوا.

---

٥٣-حديث صحيح رواه مسلم ٢٨٦٥ وفي رياض صالحين باب الولى العدل رقم ٦٦٢.



## فەرموودەی (٥٢)

**سێ جۆر زوڵم و ستەم هەیە :-**

عَـنْ أَنَسِ بْنِ مَالِـك (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (ﷺ): "الظُّلْمُ ثَلَاثَةٌ: فَظُلْمٌ لَا يَغْفِرُهُ اللَّهُ، وَظُلْمٌ يَغْفِرُهُ، وَظُلْمٌ لَا يَتْرُكُهُ، فَأَمَّا الظُّلْمُ الَّذِي لَا يَغْفِرُهُ اللَّهُ فَالشِّرْكُ، قَالَ اللَّهُ: ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ وَأَمَّـا الظُّلْمُ الَّذِي يَغْفِرُهُ، فَظُلْمُ العِبَادِ أَنْفُسَهُمْ فِيمَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ رَبِّهِمْ – عـز وجـل –، وَأَمَّا الظُّلْمُ الَّـذِي لَا يَتْرُكُهُ، فَظُلْمُ العِبَـادِ بُعْضَهُمْ بَعْضًا، حَتَّى يَقُصَّ بَعْضَهُمْ مِنْ بَعْضٍ"(٥٤).

**واتـا ئەنەســی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بــێ )ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**سێ جۆر زوڵم و ستەم هەیە:-**

**١- یەکەم جۆریان ئەو ستەمەی کە خوا لێ ی خۆش نابێ هاوبەش بڕیاردانــە بۆ خوای گــەورە وەك دەفەرمــووێ** ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾.

**٢- دووەم جۆریــان کــە خــوای گەورە لێ ی خۆش دەبێ ســتەمی**

---

٥٤- حديث حسن اخرجه الطياليسى والبزار ٢/٦٠ وحسنه شيخ الالبانى في السلسلة الصحيحـة رقم ١٩٢٧ وقال حديـث حسن وفي صحيح جامع صغـير وزيادته أيضاً للالبانى رقم ٣٩٦١ .

بەندەکانــە لەنەفســی خۆیان کەوا هەســتاون بەئەنجــام دانی تاوان لەبەینی خۆیان و خوادا.

٣- ئــەو ســتەمەی کــە خوای گــەورە لــێ ی نابــورێ و وازی لێ ناهێنێ ســتەمی بەندەکانە هەندێکیان لەهەندێکــی تریان،هەتا تۆڵە نەسەنرێتەوە،لە هەندێکیان بۆ هەندێکیان خواش لێ ی خۆش نابێ

## فەرموودەی (٥٣)

سێ شت شوێنی مردوو دەکەوێ :-

عـن أَنَس بْن مَالِـك (رضي الله عنه)، قال: قَالَ رَسُولُ اللّـهِ (ﷺ): (يَتْبَعُ المَيّتَ ثَلاَثَـةٌ، فَيَرْجِعُ اثْنَانِ وَيَبْقَـى مَعَهُ وَاحِدٌ: يَتْبَعُـهُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَعَمَلُهُ، فَيَرْجِعُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَيَبْقَى عَمَلُهُ)[٥٥].

واتا ئەنەســی کوڕی مالیك (ڕەزای خــوای لێ بێ ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

مردوو سێ شت شوێنی دەکەوێ:-

١- دۆست و کەس و کاری.

٢- سەروەت و سامان و ماڵــی.

٣- کار و کردەوەکانی.

دوانیان دەگەرێنەوە و یەکیان لەگەڵــی دەمینێتەوە دۆست و کەس وکاری لەگەڵ ســەروەت و سامان و ماڵەکەی دەگەڕێنەوە بەس خۆی و کردەوەکانی دەمێنێتەوە.

---

٥٥- حديث صحيح رواه البخاری ١١/٣١٥ ومسلم ٢٩٦٠ واخرجه احمد ٣/١٠٠.



## فەرموودەی (٥٤)

**سێ جۆر کەس ئامادەی نوێژی هەینی دەبن:-**

عن ابن عمر بن العاص (رضي الله عنهما) ما قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وآله وسلم): " يَحْضُـر الجُمُعَةَ ثَلاثَةُ نَفَر: رَجُلٌ حَضرَهـا يَلغُو وَهُوَ حَظُه منها، ورَجُلٌ حَضَرَها يَدْعو، فَهُوَ رَجُلُ دَعا الله عَزَّ وَجَلَّ إن شاءَ أَعْطَاهُ، وإنْ شَاءَ مَنَعَهْ، وَرَجلٌ حَضرَهَا بإنْصاتٍ وَسُكُوتٍ، وَلَمْ يَتَخَطَّ رَقَبَةَ مُسْلِمٍ، وَلَمْ يُؤْذِ أحداً، فَهي كَفَّارَةٌ له إلى يَـوْمِ الجُمُعَةِ التي تَليها، وَزيادَةَ ثَلاثَةَ أيّام، وَذَلِكَ أن الله عزَّ وجَلَ يقول: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ﴾[٥٦].

**واتـا عبدوڵلای کوڕی عومەری کوڕی عاص (ڕەزای خوا لە خۆی و باوکی بێ )ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وآله وسلم) فەرموویەتی:-**

**سێ جۆر کەس ئامادەی نوێژی هەینی دەبن:-**

**١- پیاوی وا هەیە لەکاتی نوێژی هەینیدا دەست دەکات بەقسەی پڕ و پوچ و بێ هودە ئەوە بەشەکەی هەر ئەوەیە کە دەی کات واتە هیچ پاداشتێکی بۆ نیە،**

**٢- پیاوی واش هەیە ئامادە دەبێت دەست ئەکات بەنزا و پاڕانەوە**

---

٥٦- حديث حسن رواه ابو داود في سننه رقم ١١٠٩ وفي عون المعبود رقم ١١١٣ وفي صحيح الجامع الصغير رقم ٨٠٤٥ .



ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بوو وەڵامی ئەداتەوە وە ئەگەر ویستیشی لەسەر نەبوو وەڵامی ناداتەوە.

٣- پیاوی واش هەیە ئامادە دەبێت بەبێ دەنگی لەسەر خۆیی، هەنگاو نانێ بەسەر ملی هیچ موسڵمانیکدا، ئازاری کەس نادات ئەم کەسە نوێژی هەینی ئەبێت بەسڕەرەوەی تاوانەکانی تا هەینی داهاتوو، وە سێ ڕۆژی کەش وەك خوای گەورە دەفەرمووێ: هەر کەسێك چاکە یەك بکات بە دەقات پاداشتی دەدرێتەوە.

## فەرموودەی (٥٥)

**لای کەعبەدا سێ پیاو مشت و مڕو دەمەقاڵەیان بوو:-**

عَـنِ ابْـنِ مَسْعُودٍ (رضي الله عنه) قَـالَ : اخْتَصَمَ عِنْـدَ الْبَيْـتِ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ قُرَشِيَّانِ وَثَقَفِيٌّ ، أَوْ ثَقَفِيَّانِ وَقُرَشِيٌّ ، قَلِيلا فِقْهُ قُلُوبِهِمْ ، كَثِيرًا شَحْمُ بُطُونِهِمْ ، فَقَالَ أَحَدُهُمْ: أَتَرَوْنَ أَنَّ اللَّهَ يَسْمَعُ مَا نَقُولُ؟ فَقَالَ الْآخَرُ: يَسْمَـعُ إِذَا جَهَرْنَا وَلَا يَسْمَعُ إِذَا أَخْفَيْنَا ، وَقَالَ الْآخَرُ: إِنْ كَانَ يَسْمَعُ إِذَا جَهَرْنَا فَإِنَّهُ يَسْمَعُ إِذَا أَخْفَيْنَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ: وَمَا كُنْتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلا أَبْصَارُكُمْ وَلا جُلُودُكُمْ)[٥٧]

**واتا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی:**

**دوو قوڕەیشـــی و ســـە قیفی یەك یان دوو سە قیفی و قوڕەیشی یەك لەپەنای کەعبەدا مشت و مڕوو دەمەقاڵەیان بوو، بەزی ناوسکیان زۆر بوو عەقڵیان تێ گەیشتنی کەم بوو.**

**١- یەکەمیان ووتی: ئایا ئەوەی ئێمە ئەیڵێین خوا ئەی بیسێت.**

**٢- دووەمیان ووتی: ئەگەر بە ئاشـــکرا و دەنگی بەرز بیڵێین ئەی بیستێ بەڵام ئەگەر بەنهێنی یەوە بیڵێین نای بیستێ.**

**٣- سێیەمیان ووتی: ئەگەر گوێ ی لەوەبێ کە بە ئاشکرا دەی ڵێین**

---

٥٧- حديـث صحيح رواه البخـاری ٨/ ٤٣٤ ومسلم ٢٧٧٥ والترمذی ٣٢٤٨ انظر تحفة الاحوذی

گوێشی لەوەیە کە بەنهێنییەوە دەی لێین

خوای گەورە بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە

ئیوە ناتوانن خۆتان بشارنەوە لەکاتێکدا گوێتان و چاوتان و پێستان شایەتیتان لەسەر بدات.



## فەرموودەی (٥٦)

**سولەیمان (علیه السلام) کاتێ لە دروست کردنی (بیتُ المقدِس) بویەوە داوای سێ شتی لەخوای گەورە کرد :-**

عـنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْـنِ الْعَاصِ (رضي الله عنه) قال: قال رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): إِنَّ سُلَيْمَـانَ بْـنَ دَاوُدَ لَمَّا بَنَى مَسْجِدَ بَيْـتِ الْمَقْدِسِ سَأَلَ اللَّهَ خِـلالا ثَلاثًا : سَأَلَ اللَّهَ حُكْمًـا يُصَادِفُ حُكْمَهُ فَأُوتِيَـهُ، وَسَأَلَ اللَّهَ مُلْكًا لا يَنْبَغِي لأَحَدٍ مِنْ بَعْدِهِ فَأُوتِيَهُ، وَسَأَلَ اللَّهَ حِينَ فَرَغَ مِنْ بُنْيَانِ الْمَسْجِدِ أَنْ لا يَأْتِيَهُ أَحَدٌ لا يَنْهَزُهُ إِلا الصَّلاةُ فِيهِ أَنْ يُخْرِجَهُ مِنْ خَطِيئَتِهِ كَهَيْئَتِـهِ يَوْمَ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ أما اثنان فقد أعطيهما، وأرجوأن يكون قد أعطى الثالثة"[٥٨].

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی عاص (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:- سولەیمان (علیه السلام) کاتێ لە دروست کردنی (بیتُ المقدِس) بویەوە داوای سێ شتی لەخوای گەورە کرد:-**

**١- وتی خوایە هەر حوکم و دادوەرییەك دەیکەم لەنێوان خەڵکیدا ڕێکی فەرمانی تۆ بێت، خوای گەورە ئەمەی پێبەخشی.**

٥٨- حدیث صحیح رواه احمد ٢/١٧٦ والنسائی ٢/٣٤ وابن ماجه ١٤٠٨ وابن حبان ١٦٣٣ وصحیح الجامع الصغیر رقم ٢٠٩٠



٢- ووتـــی ئـــەی پـــەروەردگار! ســـەروەت و ســـامان و ماڵێکـــی وام پێببەخشــە لەدوای خۆم بۆ هیچ کەســێکی تر دەســت نەدات. خوای گەورە ئەمەشی پێبەخشی.

٣- وتـــی خوایـــە هەر کەســـێك بڕواتە نـــاو (بیـــتُ المقدِس)ـەوە، مەبەســـتی هیچی تر نەبێ بێجگە لەنوێژ، خوایـــە لەتاوانەکانی پاکی بکـــەرەوە وەك ئـــەو ڕۆژەی لەدایك بـــووە، دوو نزایانی پێ بەخشـــرا هیوادار و تکاکارم سێیەمیشی پێببەخشرێ .

## فەرموودەی (٥٧)

**لەشـــەوی ئیســـراو میعراجدا ســـێ ملائیکە دێن بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم):**

عـن أَنَسَ بْنَ مَالِـكٍ (رضي الله عنه)، قَالَ يُحَدِّثُنَا عَنْ لَيْلَـةِ أُسْرِيَ بِالنَّبِيِّ (ﷺ) فِي مَسْجِـدِ الْكَعْبَةِ " أَنَّهُ جَاءَ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ قَبْلَ أَنْ يُوحَى إِلَيْهِ وَهُوَ نَائِـمٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَـرَامِ فَقَالَ أَوَّلُهُمْ : أَيُّهُمْ هُـوَ ؟ فَقَالَ أَوْسَطُهُمْ : هُـوَ خَيْرُهُـمْ ، فَقَالَ آخِرُهُمْ : خُـذُوا خَيْرَهُمْ فَكَانَتْ تِلْـكَ فَلَمْ يَرَهُمْ حَتَّـى جَاءُوا اللَّيْلَةَ الأُخْـرَى فِيمَا يَرَى قَلْبُهُ وَالنَّبِـيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَائِمَةٌ عَيْنَاهُ وَلا يَنَامُ قَلْبُهُ وَكَذَلِكَ الأَنْبِيَاءُ تَنَامُ أَعْيُنُهُمْ وَلا تَنَامُ قُلُوبُهُمْ فَتَوَلاه جِبْرِيلُ ثم عرج إلى السماء[٥٩].

**واتـــا ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) باســـی ئەوشـــەوەمان بۆ دەکات کە پێغەمبەر (ﷺ) شـــەو ڕەوی پێکرا لە (مسجد الحرام)ەوە بۆ ئاسمان، پێش ئەوەی شـــەو ڕەوی پێبکرێـــت لە (مسجد الحـــرام)دا خەوتبوو لەبەینـــی حەمزەی مامـــی و جەعفەری ئامۆزایدا ئاگای لە ئیســـرا و میعراج نەبوو لەو شەوە دا سێ مەلائیکە دێنە سەری:**

**١- یەکەمیان ووتی: کامیان ئەوە،**

**٢- دووەمیان ووتی: ئەوەیان لەناوەڕاستدایە چاکترینیانە،**

---

٥٩- حديث صحيح رواه البخاری رقم ١٤٢٨



**٣- ســێ یەمیان ووتی: دەی چاکترینیان بگرن و بیبەن بۆ ئاسمان، ئیتر ئەو شــەوە هەر ئەوەندە شــت ڕووی دا" بۆ شەوێکی کە هاتنەوە پێغەمبــەر (صلی الله علیه وآله وسلم) لەوکاتەدا چاوەکانی خەوی لــێ کەوتبوو بەڵام دڵی بەئاگابــوو ، چوونکە پێغەمبــەران (علیهم الصلاة وسلام) هەموویان هەروان چاویان خەوی لێ ئەکەوێ و دڵیان بەئاگایە ، ئیتر لەدوای ئەم جارە جیبریل (علیه السلام) خۆی سەرپەرشــتی پێغەمبەری کردووە پاشان بەرز بووەوە بۆ ئاسمان.**

## فەرموودەی (٥٨)

**سێ شت مایەی بەختیاری و خۆش گوزەرانی یە بۆ مرۆڤ سێ شتیش مایەی بەدبەختی و نارەحەتی یە بۆ مرۆڤ:**

عَنْ سَعْدِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "سَعَادَةٌ ابْنِ آدَمَ ثَلاثَةٌ، وَشَقَاوَةٌ لابْنِ آدَمَ ثَلاثَةٌ، فَمِنْ سَعَادَةِ ابْنِ آدَمَ: الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ، وَالْمَسْكَنُ الْوَاسِعُ، وَالْمَرْكَبُ الصَّالِحُ، وَشَقَاوَةُ ابْنِ آدَمَ: الْمَسْكَنُ السُّوءُ، وَالْمَرْأَةُ السُّوءُ، وَالْمَرْكَبُ السُّوءُ"[٦٠].

**واتا سەعدی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**سێ شت مایەی خۆش گوزەرانی و بەختیاری یە بۆ مرۆڤی موسڵمان و سێ شتیش مایەی بەدبەختی و نارەحەتی یە بۆ مرۆڤ:-**

**١- ئافرەتێکی باش و گوێ ڕایەڵ بۆ هاوسەری خۆی،**

**٢- خانو و بەرەیەکی فراوان و خاوەن دراوسێ ی باش و نزیك لە مزگەوت،**

**٣- سوارییەکی باش و خێرا لە ڕۆیشتندا جا چ سەیارە بێت یان**

٦٠-حديث صحيح أنظر صحيح الجامع الصغير : ٢٨٧٠ و رواه احمد ١٦٨/١ والطبراني في الاوسط والكبير ورجال احمد رجالُ صحيحٌ و رواه ابن حبان في صحيحه ٤٠٢١ والحاكم ١٤٤ وصححه و افقه الذهبي .

ئەسپ.

سێ شتیش مایەی خراپی و بەدبەختی یە بۆ مرۆڤ:

١- ئافرەتێکی خراپ و زمان درێژ و بەد ڕەفتار لەگەڵ هاوسەرەکەیدا،

٢- خانـــو و بەرەیەکی تەنـــگ و خراپ و دوور لەمزگەوت و نزیك دراوسێ ی خراپ،

٣- سواریەکی خراپ تەمەڵ لە ڕۆیشتندا.

## فەرموودەی (٥٩)

**پێغەمبەر (ﷺ) لەمزگەوتدا دانیشتبوو سێ کەس بەرەوڕوی هات:-**

عن أبي واقد الليثي (رضي الله عنه) قــال: أن رسول الله (ﷺ) بينما هو جالس في المسجد والناس معــه إذ أقبل نفر ثلاثة فأقبل اثنان إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم وذهب واحد قال فوقفا على رسول الله صلى الله عليه وسلم فأما أحدهما فرأى فرجة في الحلقة فجلس فيها وأما الآخر فجلس خلفهــم وأما الثالث فأدبر ذاهبا فلما فرغ رســول الله صلى الله عليه وسلم قــال ألا أخبركم عن النفر الثلاثة أمــا أحدهم فأوى إلى الله فآواه الله وأما الآخر فاستحيا فاستحيا الله منه وأما الآخر فأعرض فأعرض الله عنه[٦١].

**واتا ئەبو واقیدی لەیسی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی:**

**پێغەمبــەر (ﷺ) لەمزگەوتــدا دانیشــتبوو، خەڵـکیــش لەدەوریا دانیشــتبوون سێ کەس بەرەو ڕووی دانیشــتنەکە هاتن،دوانیان هاتنە پێشــەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی تریشــیان ڕۆیشــت، جا دوو کەسەکە بەدیار پێغەمبەرەوە (ﷺ) ڕاوەستان.**

**١- یەکەمیــان لەکۆڕەکــەدا کەلێن و بۆشــاییەکی دۆزییــەوە تیایا دانیشت،**

---

٦١- حديث صحيح متفق عليه رواه البخاری رقم ١٤٣ ومسلم ٢١٧٦ .



**٢- دووەمیشیان لەپشت خەڵکەکەوە دانیشت.**

**٣- سێ یەمیان پشتی هەڵکردوو ڕۆیشت.**

**کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لە دانیشـــتنەکە لـــێ بوویەوە فەرمووی ئایا! هەواڵتان بدەمێ لەبارەی ئەو سێ نەفەرەوە:**

**١- یەکەمیان پەنای بردەبەر خوای گەورە، خوداش پەنای دا،**

**٢- دووەمیان شەرموو حەیای کرد لەخوا، خواش شەرمی کرد لەو، شەرمێك کەشایستەی (خۆیەتی).**

**٣- ســـێ یەمیان پشتی هەڵ کردوو ڕۆیشـــت خوای گەورەش پشتی هەڵ کرد لێ ی**

## فەرموودەی (٦٠)

**سێ کەس ڕۆیشتن بۆ ماڵـی یەکێ لەهاوسەرەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وآله وسلم) لەبارەی پەرستش و بەندایەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وآله وسلم) پرسیاریان کرد.**

عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) قال: جاء ثلاثة رهط إلى بيوت أزواج النبـي (صلى الله عليه وآله وسلم) يسألـون عن عبـادة النبـي (صلى الله عليه وآله وسلم) فلما أخـبروا كأنهم تقالوهـا فقالـوا وأين نحن من النبي صلى اللـه عليه وسلم قد غفر له ما تقدم من ذنبه وما تأخر قال أحدهم أما أنا فإني أصلي الليل أبـدا وقال آخر أنا أصـوم الدهر ولا أفطر وقال آخـر أنا أعتزل النساء فلا أتزوج أبدا فجاء رسول الله (صلى الله عليه وآله وسلم) إليهم فقال أنتم الذين قلتم كـذا وكذا أما والله إني لأخشاكم للـه وأتقاكم له لكني أصوم وأفطر وأصلـي وأرقد وأتزوج النساء فمن رغـب عن سنتي فليس مني[٦٢].

**واتا ئەنەسـی کـوڕی مالـیك** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرموویەتی: سـێ کەس ڕۆیشتن بۆ ماڵی یەکێ لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وآله وسلم) لەبارەی پەرسـتش و بەندایەتـی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وآله وسلم) پرسـياريان کرد کاتێك هەواڵيـان درايەوە وتيـان: ئاوا و ئاوايە وەك بلـێ ی بەکەميان زانی**

٦٢- حديـث صحيح : متفـق عليه رواه البخـارى ٨٩/٩ ومسلـم ١٤٠١ والنسائى ٦٠/٦ .



**وتیان : ئێمە لەکوێ و پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکوێ ئەو خوا لەهەموو تاوانەکانی پێشوو و دوای خۆش بووە.**

**١- یەکێکیان ووتی: من شەو تابەیانی نوێژ دەکەم هەتا ماوم،**

**٢- دانەیەکی تریان وتی: من هەموو ســاڵ (دوانزە مانگ) بەڕۆژ و دەبم و یەك ڕۆژی لێ ناخۆم،**

**٣- کۆتاهەمینیــان ووتــی: منیش کەنارگیر دەبم لە ژن و قەت ژن ناهێنم،**

**جا پێغەمبەر (ﷺ) هاتەوە بۆ لایان و فەرمووی: ئیوە واو وا دەلێن! دەســا ســوێند بەخوا من لەهەموو تان زیاتر لەخوا دەترسم و تەقوام هەیە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشــدا بەڕۆژو دەبم و لێشی دەخۆم، شەو نوێژ دەکــەم و دەش خــەوم، وە ژنیش ئەهێنم ئەمانە ســونەت و ڕێگە و ڕەوشتی منن هەر کەس لێ ی لابدات لەمن نی یە.**

## فەرموودەی (٦١)

**جنۆکە سێ جۆر و شێوازیان هەیە:**

عَـنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ (رضي الله عنه)، قَالَ: قَــالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "الْجِنُّ عَلَى ثَلاثَةِ أَصْنَافٍ: صِنْفٌ لَهُمْ أَجْنِحَةٌ يَطِيرُونَ فِي الْهَوَاءِ، وَصِنْفٌ حَيَّاتٌ وَكِلابٌ، وَصِنْفٌ يَحِلُّونَ وَيَظْعَنُونَ"[٦٣].

**واتا ئەبو ســەعلەبە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**جنۆکە سێ جۆر و شێوازیان هەیە:-**

**١- جۆرێکیان باڵیان هەیە و لەهەوادا دەفڕن،**

**٢- جۆرێکی تریشیان مار و سەگن،**

**٣- جۆرێکی تریشیان نیشتەجێ و کۆچەرین.**

٦٣- حدیـث صحیح رواه الطبرانـی والحاکم والبیهقي بأسنـاد صحیح انظر صحیح الجامع الصغیر للالباني الحدیث ٣١١٤ .



## فەرموودەی (٦٢)

**نوێژ لە سێ بەش پێك دێت:-**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "الصَّلاةُ ثَلاثَةُ أَثْلاثٍ: الطُّهُورُ ثُلُثٌ، وَالرُّكُوعُ ثُلُثٌ، وَالسُّجُودُ ثُلُثٌ، فَمَنْ أَدَّاهَا بِحَقِّهَا قُبِلَتْ مِنْهُ، وَقُبِلَ مِنْهُ سَائِرُ عَمَلِهِ، وَمَنْ رُدَّتْ عَلَيْهِ صَلاتُهُ رُدَّ عَلَيْهِ سَائِرُ عَمَلِهِ"(٦٤).

واتــا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

نوێژ سێ سێ یەکە، واتە بریتی یە لەسێ بەشی سەرەکی:

١- جوان خۆ پاك کردنەوە لەســەر ئاودەست و پاك ڕاگرتنی کالاّ و جل و بەرگ و دەست نوێژگرتن بەشێکییەتی،

٢- جوان چەمینەوەو (ڕکوع) بەشێکی تریەتی.

٣- جوان کڕنوش بردن (سُجُد) بەشــێوازێك هەموو لەش لە جولە بکەوێت بەشەکەی تریەتی

ئــەوەی فەرزەکانــی نوێژ بەجوانــی بەجێ بهێنــێ نوێژەکەی لێ وەردەگیرێ، لەگەڵ هەموو کردەوەکانی تریدا، وە هەر کەســێ نوێژی لێ وەرنەگیرێ هەموو کردەوەکانی تریشی لێ وەرناگیرێ و دەدرێتەوە بەسەریا.

---

٦٤- ١) حديث حسن رواه البزار ١/١٧٧ واسناده حسن كما قال الهيثمي في مجمع الزوائد ٢/١٤٧ و صححه شيخ الالباني في سلسلة الصحيحه رقم ٢٥٣٧ .

## فەرموودەی (٦٣)

**سەفەرکردن تەنها بۆ سێ مزگەوت دروستە بەنیاز و مەبەستی پەرستش و بەندایەتی:-**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لا تُشَدُّ الرِّحَالُ إلا إِلَى ثَلاثَةِ مَسَاجِدَ: الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَمَسْجِدِي هَذَا، وَالْمَسْجِدِ الأَقْصَى"(٦٥).

**واتا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**دروست نی یە سەفەرکردن بەنیازی پەرستش و بەندایەتی (الطواف) تەنها بۆ ئەم سێ مزگەوتە نەبێ:-**

**١- مزگەوتی (حرام) لە مککە،**

**٢- مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینە،**

**٣- مزگەوتی (الاقصى) لە قودس**

---

٦٥- ١) حديث صحيح رواه البخارى انظر مختصر صحيح البخارى رقم ٥٨٦ والترمذى ٣٢٦ و صحيح سنن ابن ماجه ١١٥٧ و احمد في المسند ٢/٢٣٢ .



## فەرموودەی (٦٤)

**مۆری ئەموستیلەکەی پێغەمبەر (ﷺ) سێ دێڕ بووە:**

عَــنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) قال: "كان نقش خَاتَمِ النَّبِيِّ (ﷺ) ثَلاَثَةَ أَسْطُرٍ: مُحَمَّدٌ سَطْرٌ، وَرَسُولُ سَطْرٌ، وَاللَّهِ سَطْرٌ"(٦٦).

**واتــا ئەنەســی کــوڕی مالــیــك** (ڕەزای خــوای لــێ بــێ) **ئەفەرمــوێ ئەموستیلەکەی پێغەمبەر (ﷺ)**

**نەخش و مۆرەکەی سێ دێڕ بووە:**

**١- دێرِێــکی موحەمەد بووە (ﷺ).**

**٢- دێــرێکی ڕەســول بووە.**

**٣- دێرێــکی (الله) بووە.**

---

٦٦-حديــث صحيــح رواه البخــارى ٣٤١/١٠ والترمذى رقــم ١٧٤٨ انظر تحفه الاحوذي للمبارك الفوري .

## فەرموودەی (٦٥)

**نیشانەی مرۆڤی دووڕوو (المنافق) سێ شتە:-**

عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: "آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، زاد في روايه المسلم وإِن صام وصلى وزعم أنه مسلم[٦٧].

**واتــا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**نیشانەی مرۆڤی دوو ڕوو (المنافق) سێ شتە:-**

**١-ئەگەر قسەی کرد درۆ ئەکات.**

**٢-ئەگەر بەڵێن و پەیمانێکی دا نایباتە سەر.**

**٣-ئەگەر ڕاسپاردەیەکی لا دابنێیت ناپاکی و خیانەتی لێ دەکات.**

**لەڕیوایەتی (مســلم) دا ئەمەشــی بۆ زیاد کردووە. هەر کەسێ ئەم ســێ نیشــانەی تێدا بێ ئــەوە موناففقە! با نوێژیش بــکات، و ڕۆژیش بگریت، و خۆی بەموسڵمان بزانێت!.**

---

٦٧-حديث صحيح متفق عليه رواه البخاری ١/٨٣/٨٤ و مسلم رقم ٥٩ .



## فەرموودەی (٦٦)

**درۆکردن تەنها لەسێ کاتدا دروست و ڕەوایە:**

عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "لا يَحِلُّ الْكَذِبُ إِلا فِي ثَلاثٍ: يُحَدِّثُ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ لِيُرْضِيَهَا، وَالْكَذِبُ فِي الْحَرْبِ، وَالْكَذِبُ لِيُصْلِحَ بَيْنَ النَّاسِ"[٦٨].

**واتا ئەسمائی کچی یەزید (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**درۆکردن دروست و ڕەوانی نی یە بە هیچ شێوازێك تەنها لەسێ کاتدا نەبێ:-**

**١- پیاوێك قسەبکات بۆ خێزانەکەی بە درۆوە بۆ ئەوەی رازی بکات،کاتێك هەڵی پێچابێت بۆ شتێك،کێشەیان بۆ دروست بێت.**

**٢- درۆکردن لەکاتی شەڕو و ڕووبەڕو بونەوە لەگەڵ کافراندا،**

**٣- درۆکردن بۆ ڕێکخستن و باش کردنی پەیوەندی نێوان خەڵکی.**

---

٦٨- حديث صحيح رواه البخاري رقم ٢٦٩٢ و مسلم ٢٦٠٥ والترمذي في سننه رقم ١٩٤٥ .

## فەرموودەی (٦٧)

**بەرگریم لەسێ شت کردبوون بەڵام ئێستا فەرمانتان پێدەکەم بیان کەن:**

عـن بريدة (رضي الله عنه) قال: قــال رسول اللــه (ﷺ) نهيتكم عن ثلاث وأنا آمركم بهن نهيتكم عن زيارة القبور فزوروها فإن في زيارتها تذكرة ونهيتكم عن الأشربة أن تشربوا إلا في ظروف الأدم فاشربوا في كل وعــاء غير أن لا تشربوا مسكــرا ونهيتكم عن لحوم الأضاحي أن تأكلوها بعد ثلاث فكلوا واستمتعوا بها في أسفاركم(٦٩).

**واتــا بورەیدە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**بەرگریم لێ کردبوون لە سێ شت بەڵام ئێستا فەرمانتان پێ دەکەم بیان کەن:-**

**١- بەرگریم لێ کردبوون لەســەردانی گۆرســتان، بەڵام ئێستا بڕۆن سەردانیان بکەن، چونکە لەسەر دانیاندا یادکردنەوە هەیە،**

**٢- بەرگریــم لێ کردبوون لە دەفرو و دۆڵەی لە پێســت دروســت کــراودا بخۆنەوە،بەڵام ئێســتا بخۆنــەوە لەهەموو دەفــرو دۆڵەیەکدا بەمەرجێ شتی سەرخۆش کەر نەخۆنەوە،**

**٣- بەرگریم لێ کردبوون لەپاش ســێ ڕۆژ لەگۆشتی قوربانی نەخۆن، بەڵام لەمەودا لەسێ ڕۆژ زیاتر لێ ی بخۆن و توێشوی ڕێگاشی لێ هەڵبگرن.**

---

٦٩- حديث صحيح أخرجه النسائي ٥١٨٥ وابواد رقم ٣٦٩٤ في عون المعبود وفي صحيح الجامع الصغير رقم ٦٧٨٨



## فەرموودەی (٦٨)

**لەسێ شتدا ڕام لەگەڵ فەرمانی خوادا یەکی گرتووە :-**

عن عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه) قال: "وَافَقْتُ رَبِّي في ثَلاث، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَو اتَّخَذْنَا مِنْ مَقَام إِبْرَاهِيمَ مُصَلَّى، فَنَزَلَتْ: وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَـام إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى سورة البقرة آيـة ١٢٥. وَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ نِسَائَكَ يَدْخُلُ عَلَيْهِنَّ الْـبَرُّ وَالْفَاجِرُ فَلَوْ أَمَرْتَهُنَّ أَنْ يَحْتَجِبْنَ. قَالَ: فَنَزَلَتْ آيَـةُ الْحِجَابِ، وَاجْتَمَعَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّـى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نِسَـاؤُهُ فِي الْغَيْرَةِ. فَقُلْتُ لَهُنَّ: عَسَى رَبُّـهُ إِنْ طَلَقَكُنَّ أَنْ يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ، فَنَزَلَتْ كَذَلِكَ"(٧٠).

**عومەری کوڕی خەتاب** (ڕەزای خوای لێ بێ) **فەرموویەتی:**

**لەسێ شتدا ڕام لەگەڵ فەرمان و بڕیاری خوادا یەکی گرتووە:**

**١- وتـم ئەی پێغەمبەر خوا (ﷺ)! خۆزگـە مەقامی ئیبراهیممان دەکرد بەجێگای نوێژ بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە:**

﴿ وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾ ﴾ البقرة

**٢- وتـم ئـەی پێغەمبـەر خـوا (ﷺ) خۆزگـە فەرمانـت دەکرد بەخێزانەکانت کە خۆیان داپۆشـن و لەپشـتی پەردەوە نەبێ قسەیان**

---

٧٠- حديـث صحيح رواه البخـارى انظر مختصر صحيح البخـارى رقم ٢٥٥ باب القبلة



**لەگەڵ کەســدا نەدەکرد چونکە چاك و خراپ قسەیان لەگەڵدا دەکات بەم بۆنەشەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە**

﴿ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ﴿٥٣﴾ ﴾ الأحزاب

**٣- کاتــێ خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کۆبونــەوە دژی پێغەمبەر (ﷺ) لەبــەر هەویــە باری پێم ووتــن** ﴿ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ ﴿٥﴾ ﴾ التحريم

**بەم بۆنەشەوە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە.**

## فەرموودەی (٦٩)

**خۆتان لەسێ کردەوە بپارێزن کەدەبنە هۆی لەعنەت لێ کردنتان:-**

عَـنْ مُعَاذِ بْـنِ جَبَلٍ (رضي الله عنه) قال: قَـالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صلی الله علیه وآله وسلم): "اتَّقُوا الْمَلاعِنَ الثَّلاثَ: الْبَرَازَ فِي الْمَوَارِدِ، وَقَارِعَةِ الطَّرِيقِ، وَالظِّلِّ "[٧١].

**واتــا موعاز** (ڕەزای خوای لێ بێ) **ئەگێڕێتــەوە لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وآله وسلم) فەرموویەتی:-**

**خۆتان لەو سێ کردەوە بپارێزن کە دەبنە هۆی لەعنەت لێ کردنتان لەلایەن خەڵـکی یەوە:**

**١- پیسای کردن لەسەر کانیاو و سەرچاوەی ئاوی خەڵـکی،**

**٢- پیسای کردن لەسەر ڕێگای خەڵـکیدا،**

**٣- پیسای کردن لەسێبەرو و حەوانەوەی شوێنی خەڵــکیدا.**

---

٧١-حدیـث حسن رواه ابو داود ٢٦ ، وابن ماجه ٣٢٨ وفي صحیح الجامع الصغیر وزیادته رقم ١١٢ .



## فەرموودەی (٧٠)

**بەیەکێ لەم ســێ ڕێگایە نەبێ دروست نییە ڕشتنی خوێنی مرۆڤی باوەڕدار:-**

عــن عَبْدُ اللَّه بــن مسعود (رضي الله عنه) قال: قَالَ رَسُــولُ اللَّهِ (ﷺ): "لا يَحِـلُّ دَمُ امْــرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَـدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا اللَّــهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، إلا بِإِحْـدَى ثَـلاثٍ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالثَّيِّبُ الــزَّانِي، وَالتَّــارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ "[٧٢].

**واتــا عەبدوڵڵای کوڕی مســعود** (ڕەزای خوای لێ بــێ) **ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**دروست نیە ڕشتنی خوێنی هیچ باوەڕدارێك کەشایەتی بدات بێجگە لە (الله) هیچ پەرســتراوێکی تری بەحەق نی یە، وەشایەتی بدات من ڕەوانەکراوی خوام بەیەکێ، لەم سێ ڕێگایە نەبێ:**

**١- کەسێك کەسێکی بەناڕەوا کوشتبێ دەبێ بکوژرێتەوە،**

**٢- پیاوێك ژنی هێنابێ و ژنێك شوی کردبێ و زینابکەن دەبێ بکوژرێن،**

**٣- کەســێك لە دین پاشــگەزبووبێتەوە و لەکۆمەڵی موسڵمانان واز بێنێ و مورتەد بێتەوە.**

---

٧٢-حديث صحيح رواه البخاری رقم ٦٨٧٨ ومسلم ١٦٧٦ والترمذی رقم ١٤٠٢ وابو داود رقم ٤٣٥٢ .



## فەرموودەی (٧١)

**بــەردەوام بەنــی تەمیمم خۆش دەوێ لەوەتەی ئەو ســێ شــتەم لەپێغەمبەر (ﷺ) بیستووە دەربارەیان :-**

عـن أبـي هريرة (رضي الله عنه) قال: مـا زلت أحب بني تميـم منذ ثلاث سمعـت من رسول اللــه (ﷺ) يقول فيهم سمعته يقــول هم أشد أمتي علــى الدجال قال وجاءت صدقاتهم فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم هذه صدقات قومنا وكانت سبية منهم عند عائشة فقال أعتقيها فإنها من ولد إسماعيل[٧٣].

**واتــا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: بەردەوام بەنی تەمیمم خۆش دەوێ لەو کاتەوە ئەو ســێ شــتەم لە پێغەمبەر (ﷺ) بیستووە دەربارەیان فەرموویەتی:-**

**١- ئازاترینی گەلەکەمن لەڕووی دەجالدا،**

**٢- کەزەکاتەکانیشیان هات فەرمووی: ئەمە زەکاتی خزمانی ئێمەیە.**

**٣- ژنێکــی بەتاڵانــی گیراویشــیان کە نیزەکی عائیشــە بوو پێ ی فەرموو: ئازادی بکە چونکە ئەمە لەنەوەی ئیسماعیلە.**

---

٧٣- حديث صحيح رواه البخاری ٥٦٨١ انظر فتح الباري



## فەرموودەی (٧٢)

### هەریەکێ نزای خێربکات یەکێك لەم سێ شتەی پێدەبەخشرێ:

عـن أبي سعيد الخدري (رضي الله عنه) أن النبــي (ﷺ) قال: ما من مسلم يدعــو بدعوة ليس فيها إثم ولا قطيعة رحــم إلا أعطاه الله بها إحدى ثــلاث: إما أن يستجب له دعوتــه، أو يصرف عنه من سوء مثلها، أو أن يدخرها له في الآخرة[٧٤].

واتـــا ئەبو ســـەعیدی خـــودری (ڕەزای خوای لـێ بـێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

هەرموســـڵمانێك داوا و دوعـــا لەخوای گەورە و پـــەروەردگار بکات بەمەرجـــێ داواکەی شـــتی گونـــاه نەبێ، بۆ بڕین و صیلەی ڕشـــتەی خزمایەتی نەبێ خوای گەورە یەکێ لەم سێ شتەی پێ دەبەخشێ:

١- یان داواکەی دەست بەجێ گیرا دەکات،

٢- یان بەئەندازەی ئەو داوایە خوای گەورە خراپەی لێ دوور ئەخاتەوە،

٣- یـــان داواکەی بۆ هەڵدەگرێت و دەیکات بە توێشـــویەك بۆی بۆ ڕۆژی دواى.

---

٧٤-حديـث صحيـح أخرجه احمـد ٣/١٨ و صححه الشيخ الالبانـي في صحيح ادب المفـرد و صححـه شيخ الآرنـؤوط في شرح عقيـدة الطحاوية والحاكـم ١/٤٩٣ و صححه و وافقه الذهبي.



## فەرموودەی (٧٣)

**ئەو گاڵتە و گەپانەی کە پاداشتیان لەسەروەر دەگیرێ تەنها سیانن:-**

عنْ أَبي الـدَّرْدَاءِ (رضي الله عنه) قال: قال رسول اللـه (ﷺ): "اللَّهْوُ في ثَلاث: تَأْدِيبِـكَ فَرَسَكَ، وَرَمْيِكَ بِقَوْسِكَ، أَوْ قَـالَ: نَصْلَكَ، وَمُلاعَبَتِكَ أَهْلَكَ "(٧٥).

**واتـا ئەبو درداء (ڕەزای خـوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لـە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**لەسێ شتدا گاڵتە و گەپ دروستە و پاداشتی لەسەر وەردەگیرێ:-**

**١- مەشق کردن بە وڵاخی سواری و پێشبرکێ کردن.**

**٢- تیر ئەندازەی و نیشانە شکاندن.**

**٣- گاڵتـە و یاری کردنـی پیاو لەگەڵ هاوسـەری خۆیدا بەنیەتی خستنەوەی وەچەی باش و چاك.**

---

٧٥- حديـث صحيح رواه ابـو داود انظر صحيح الجامع الصغـير رقم ٥٤٩٨ وفي فيض القدير رقم ٧٧٥٣



## فەرموودەی (٧٤)

مردوو تەنها لە سێ ڕێگاوە خێـری پێ دەگات:-

عَـنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قال: قـال رَسُولَ اللَّـه (ﷺ): "إِذَا مَاتَ الإِنْسَـانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلا مِنْ ثَلاثٍ: صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ "(٧٦).

واتـا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

مرۆڤ کاتێ مرد لەسێ ڕێگاوە نەبێ خێر و چاکەی پێ ناگات:

١- چاکەیەکی کردبێ و دوای خۆی بەردەوام بێت،

وەك دروسـت کردنی مزگەوتێك یان پردێك یان هەر کارێکی خێر کە دوای مردنی خۆی خەڵکی سودی لێ ببینن.......

٢- زانسـت و زانیارییەکی بەجێ هێشـتبێ خەڵکـی لەدوای خۆی سودی لێ وەربگرن،

٣- منداڵـێکی باشـی لەدوا بەجێ مابێ و داوای لێ خۆش بوون و نزای خێری بۆ بکات لای خوای گەورە.

---

٧٦- حديـث صحيـح رواه مسلـم ١٦٣١ والبخاری في الادب المفـرد ٣٦ الترمذی ١٣٧٦ والنسائی ٦/٢٥١ و احمد ٢/٣٧٢ .



## فەرموودەی (٧٥)

زۆر خۆشەویستم ئامۆژگاری کردم بەسێ شت:-

عـن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: أوصـاني خليلي (ﷺ) بثلاث صيام ثلاثة أيام من كل شهر وركعتي الضحى وأن أوتر قبل أن أنام[٧٧].

واتا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ)فەرموویەتی : زۆر خۆشەویستم پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامۆژگاری کردم بەسـێ شـت تا مردن وازیان لێ نەهێنم:-

١- بەڕۆژو بوونی سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێکدا،

٢- وە بەکردنی دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگا (الصلاة الضحى)،

٣- وەبەکردنی نوێژی وەترلە پێش خەوتندا.

---

٧٧-حديث صحيح : متفق عليه رواه البخاری ٣/٤٧ ومسلم ٧٢١ وأخرجه ابو داود ١٤٣٢ والترمذی ٧٦٠ .

## فەرموودەی (٧٦)

**زۆر خۆشەویستم ئامۆژگاری کردم بەسێ شتی تر:**

عَـنْ أَبِي ذَرّ (رضي الله عنه)، قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي بِثَــلاثٍ: "اسْمَعْ وَأَطِعْ وَلَـوْ لِعَبْدٍ مُجَـدَّعِ الأَطْـرَافِ، وَإِذَا صَنَعْتَ مَرَقَةً فَأَكْـثِرْ مَاءَهَا، ثُمَّ انْظُـرْ إِلَى أَهْلِ بَيْتٍ مِنْ جِيرَانِكَ فَأَصِبْهُمْ مِنْهُ بِمَعْرُوفٍ، وَصَلِّ الصَّلاةَ لِوَقْتِهَا[٧٨].

**واتــا ئەبو زەڕ (ڕەزای خـــوای لێ بێ) فەرموویەتی زۆر خۆشەویســتم پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامۆژگاری کردم بەسێ شت فەرمووی:-**

**١- ببیستە و گوێڕایەڵ بە، بابەندەیەکی لوت بڕاویش بێت بەفەرمان ڕەوات، مادەم بیەوێت کتێبەکەی خوا لەناوتاندا جێگیر و پیادە بکات،**

**٢- ئەگەر شلەیەکت لێ نا ئاوی زۆری تێبکە، پاشان سەیری ماڵەکانی ئەم لاو ئەولات بکە و لەو شلەیە بەشیان بدە، بەباشی**

**٣- وە نوێژەکانت هەردەم و هەموو کات لەکاتی خۆیدا ئەنجام بدە.**

---

٧٨- حديـث صحيح رواه البخاري في الادب المفرد ١١٣ ومسلم مختصراً في البر و الصلة ٢٦٢٥ .



## فەرموودەی (٧٧)

**پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاری کردوین بە سێ شت:-**

عـن ابن عباس (رضي الله عنهما)، أن النبـي (ﷺ) اوصيني بثلاث فقال: أخرجوا المشركـين من جزيرة العرب، وأجيـز الوفد بنحو ما كنت اجزهـم وسكت عن الثالثـة وقيل هي لا تتخذوا قـبري وثنا، وقال النووي ثالثه جيش أسامة[٧٩].

**واتـا عەبدوڵـڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خـوا لەخۆی و باوکی بێ) فەرموویەتـی : پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئامۆژگاری کردیـن لەکاتی سەرەمەرگدا بەسێ شت فەرمووی:**

**١- هاوبەش بڕیار دەرەکان (المشرکین) لە دوورگەی عەرەب بکەنە دەرەوە،**

**٢- مـن خۆم چـۆن (وەفـد) بەڕێ دەکەم ئێوەش بەهەمان شـێوە بەڕێ ی بکەن.**

**٣- وە لە سێ یەم بێ دەنگ بوو دەڵێن فەرموویەتی:**

**لەدوای خۆم گۆڕەکەم مەکەن بەبت و بی پەرستن،**

**ئیمامـی نەوەویـش دەفەرموێ : سـێ یەم بەڕی کردنی لەشـکری ئوسامەیە** (ڕەزای خوای لێ بێ)

---

٧٩- حديـث صحيح رواه البخـارى رقم ٣٠٥٣ كتاب الجهـاد و كتاب الجزيه رقم ٣١٦٨ والمغازى رقم ٤٤٣١ ومسلم كتاب الوصية رقم ٢٠



## فەرموودەی (٧٨)

### فەرمان ڕەوا لەقورەیشە هەتا كار بەسێ شت بكەن

عَــنْ أَنَسِ بْنِ مَالِك (رضي الله عنه)، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "الأُمَرَاءُ مِنْ قُرَيْشٍ مَا عَمِلُوا فِيكُمْ بِثَلاثٍ: مَا رَحِمُوا إِذَا اسْتُرْحِمُوا، وَأَقْسَطُوا إِذَا قَسَمُوا، وَعَدَلُوا إِذَا حَكَمُوا"(٨٠).

واتا ئەنەســـی كوڕی مالــیك (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: فەرمان ڕەوا لەقورەیشە هەتا كار بەسێ شت بكەن:

١- لەناو ئێوەدا بەسۆز و بەزەی بن ئەگەر داوایان لێ كرا.

٢- دادپەروەر بن لەكاتی دابەش كردندا.

٣- دادپەروەربن لەكاتی بڕیاردان و حوكم داندا.

---

٨٠- حديث صحيح رواه الحاكم انظر الصحيح الجامع الصغير و زيادته رقم ٣٦٨٤ وفي الارواء رقم ٥٢٠



## فەرموودەی (٧٩)

خــوای گەورە ڕێزێکی زیادەی لێ گرتوین بەســەر گەلانی پێشــودا بەسێ شت :-

عَـنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ (رضي الله عنه) قال: عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "فُضِّلْنا عَلَى النَّاسِ بِثَـلاثٍ: جُعِلَتْ صُفُوفُنَا كَصُفُـوفِ الْمَلائِكَةِ، وَجُعِلَ لَنَا الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدًا، وَجُعِلَتْ تُرْبَتُهَا لَنَا طَهُـورًا إِذَا لَمْ نَجِدِ الْمَاءَ"[٨١].

واتــا حوزەیفە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتــەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:-

خــوای گەورە ڕێزێکی زیادەی لێ گرتوین بەســەر گەلانی پێشــودا بەسێ شت:-

١- لەنوێژدا ڕیزەکانمان وەك ڕیزی مەلائیکە وایە،

٢- خاکــی ســەر ڕوی زەوی هەمووی بۆ ئێمــە وەك مزگەوت وایە لەهەر کوێیەکدا بمانەوێ نوێژی تێدا دەکەین،

٣- ڕێــزی داویــن بەوەی کــە خۆڵەکەی ســەر ڕوی زەوی بۆ ئێمە خاوێن و پاك کەرەوەیە ئەگەر ئاومان دەست نەکەوت.

---

٨١- حديث صحيح: رواه مسلم رقم ٥٢٢ كتاب المساجد المواضع الصلاة.



## فەرموودەی (٨٠)

**مرۆڤ لەماڵی خۆی تەنها سێ شتی بۆ هەیە:**

عَـنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "يَقُولُ الْعَبْدُ مَالِي مَـالِي، وَإِنَّمَا لَهُ مِنْ مَالِهِ إِلاَّ ثلاث مَـا أَكَلَ فَأَفْنَى، وَمَا لَبِسَ فَأَبْلَى، وَمَـا أَعْطَى فَأَمْضَى، وَمَا سِوى ذَلِـكَ فَإِنَّهُ ذَاهِبٌ وَتارِكُهُ لِلنَّاسِ"[٨٢].

واتـا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

مـرۆڤ دەڵێ ماڵـەکەم ماڵـەکەم لەگەڵ ئەوەشـدا لەماڵـی خۆی تەنها سێ شتی بۆ هەیە:

١- ئەوەی خواردویەتی و نەماوە،

٢- ئەوەی پۆشیویەتی و ڕزاندویەتی،

٣- ئەوەی بەخشیویەتی و داویەتی بەخەڵـکی هەژار و نەدار لەبەر خوا، بووە بەتێشویەك بۆی لەڕۆژی دوایدا.

بێجگە لەم سێ شتە هەموو ئەڕواو بۆ خەڵـکی بەجێ دەهێڵێ.

---

٨٢- حديث صحيح رواه مسلم ٨/٢١١ و احمد ٢/٢٦٨ ، ٤١٢ و ابن حبان ٢٤٨٧ .



## فەرموودەی (٨١)

**لەسەر سێ شێواز لەڕۆژی دوایدا خەڵکی حەشر دەکرێن:-**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى ثَلاثِ طَرَائِقَ رَاغِبِينَ رَاهِبِينَ، اثْنَانِ عَلَى بَعِيرٍ، وَثَلاثَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَأَرْبَعَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَعَشَرَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَتَحْشُرُ بَقِيَّتَهُمُ النَّارُ، تَقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قَالُوا، وَتَبِيتُ مَعَهُمْ حَيْثُ بَاتُوا، وَتُصْبِحُ مَعَهُمْ حَيْثُ أَصْبَحُوا، وَتُمْسِي مَعَهُمْ حَيْثُ أَمْسَوْا[٨٣].

**واتــا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: لەڕۆژی دوایدا لەسەر سێ شێواز خەڵکی حەشر دەکرێن:**

**١- کۆمەڵێکیان بەترس و ئومێدەوە دەبرێن بۆ حەشر.**

**٢- کۆمەڵێکی تریان دووکەس لەسەر وشترێ، سێ کەس لەسەر وشترێ، چوار کەس لەسەر وشترێ، دە کەس لەسەر وشترێ دەبرین بۆ حەشر.**

**٣- ئــەوەی دەمێنێتــەوە هەموویان کۆدەکرێنــەوە لەئاگردا ئەگەر بیانەوێ پشــوو بــدەن ئاگرەکە لەگەڵیاندا پشــوو ئــەدات، وە ئەگەر بیانەوێ شەو لە جێگایەك بمێننەوە ئاگرەکەش لەگەڵیان دەمێنێتەوە ئەگــەر بیانەوێ بەیانی یەك لە جێگایەك بکەنەوە بەیانی یان لەگەڵ دەکاتەوە وە ئەگەر بیانــەوێ ئیوارە لە جێگایەك بمێننەوە ئێوارەیان لەگەڵدا دەکاتەوە. واتە بە هیچ شێوازێك ئاگرەکە لە کۆڵیان نابێتەوە. خوایە گیان پەنامان بدە لەو ئاگرە، آمین.**

---

٨٣-حديث صحيح رواه البخارى ٦٥٢٢ ومسلم ٢٨٦١ .



## فەرموودەی (٨٢)

**هەرکەسێ گیان (روح) لە لاشەی ڕۆشتەدەرەوە و بێ وەی بوو، لەسێ شت، دەڕواتە بەهەشتەوە:-**

عَنْ ثَوْبَانَ (رضي الله عنه) مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، عن رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): قال" مَنْ فَارَقَ الرُّوحُ الْجَسَدَ وَهُوَ بَرِيءٌ مِنْ ثَلاثٍ دَخَلَ الْجَنَّةَ: الْكِبْرِ، وَالدَّيْنِ، وَالْغُلُولِ"[٨٤].

**واتا سەوبان خزمەتکاری پێغەمبەر (ﷺ) (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**هەر کەسێ گیان لەلاشەی دەربچێت و پارێزراو بێ لەسێ شت دەڕواتە بەهەشتەوە:-**

**١- لە خۆبەگەورە زانین،**

**٢- لەقەرزاری،**

**٣- لەناپاکی و دەغەلی و دزیکردن لەغەنیمەت.**

---

٨٤- حديث صحيح أنظر صحيح ابن ماجه رقم ١٩٥٦ والترمذى رقم ١٥٧٢ والحاكم ٢/٢٦ وصححه و وافقه الذهبي وفي صحيح الجامع الصغير رقم ٦٤١١



## فەرموودەی (٨٣)

**گەورەترین ناوی خوای گەورە ئەگەر داوای پێبکرێت وەڵام دەدرێتەوە لەسێ سورەتدایە:**

عن أبي أمامة (رضي الله عنه) أن رسول الله (ﷺ) قال: ( اسْمُ اللَّهِ الأَعظَمُ الـذي اذا دعي به أجاب فِي سُوَرٍ مِنَ القُرآنِ ثَـلاَثٍ: فِي "البَقَرَةِ" وَ "آلِ عِمرَانَ" وَ "طَهَ" )[٨٥].

**واتا ئەبـی ئومامە(ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: گەورەترین نـاوی خوا ئەگەر نزاو پاڕانەوەی بێ بکرێت وەڵام ئەدرێتەوە لە سێ سورەتدایە لە قورئانی پیرۆزدا :**

**١- لەسورەتی بەقەرەدا**

﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾ ﴾

**٢- لەسورەتی ئالی عمراندا**

﴿ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ﴿٢﴾ ﴾

**٣- لەسورەتی طاهادا**

﴿ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ ﴿٨﴾ ﴾

---

٨٥- حديث صحيح رواه ابن ماجه والحاكم والطبراني في الكبير انظر صحيح الجامع الصغير وزياته للشيخ الالباني رقم ٩٧٩ و في فيض القدير رقم ١٠٣١



## فەرموودەی (٨٤)

**مرۆڤ كاتێ ئەخەوێ شەیتان سێ گرێ ئەدات لە پشت سەری:-**

عَـنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)، قَــالَ: "يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَـى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَ نَامَ ثَلاثَ عُقَـدٍ، كُلُّ عُقْدَةٍ يَضْرِبُ مَكَانَهَا عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ فَارْقُدْ، فَإِذَا اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِذَا تَوَضَّـأَ انْحَلَّتْ عُقْدَتَانِ، فَإِذَا صَلَّى انْحَلَّتِ الْعُقَدُ كُلُّهَا، وَأَصْبَحَ طَيِّبَ النَّفْسِ نَشِيطًا، وَإِلا أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلانَ "[٨٦].

**واتــا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**كاتێ یەكێ لە ئێوە دەخەوێ شەیتان سێ گرێ دەدات لەپشت سەری لەگەڵ هەرگرێیەك كە لێ ی دەدات پێ ی دەڵێ: شەوێكی درێژت لەسەرە بخەوە.**

**١- ئەگەر لەخەو هەستاو یادی خوای كرد گرێیەكیان دەكرێتەوە.**

**٢- ئەگەر دەست نوێژی شۆرد گرێیەكی تریشیان دەكرێتەوە.**

**٣- ئەگەر نوێژی كرد ئەوا هەموو گرێكان دەكرێنەوە ئینجا بەیانی دەكاتەوە بەنەفسی پاك و لەشی سوكەوە وە ئەگەر وای نەكرد بەیانی دەكاتەوە بە نەفسێكی پیس و لەشی قورس و تەمەڵییەوە هەڵدەسێت.**

---

٨٦- حديــث صحيح متفق عليه رواه البخــاری ٣/٢٠ و مسلم رقم ٧٧٦ وابو داود ١٣٠٦ والنسائی ٣/٢٠٣ والترمذی ٢٤٨٧ .



## فەرموودەی (٨٥)

**پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بە ئیمام علی (ڕەزای خوای لێ بێ) سێ شت هەیە دوایان مەخە:**

عن علي (رضي الله عنه)، أن النبي (ﷺ) قال: "يا علي! ثلاث لا تؤخرها: الصلاة إذا أتت، والجنازة إذا حضرت، والأيم إذا وجدت لها كفؤا[٨٧].

**واتا عەلی کوڕی ئەبی طالب (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەفەرموێ: پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی فەرموم: ئەی عەلی! سێ شت هەیە دوایان مەخە و لەکاتی خۆیدا ئەنجامیان بدە:-**

**١- نوێژ کە کاتی هات، هەتا زوو بیکەی درەنگە،**

**٢- مردوو کاتێك کە دەمرێت هەتا زوو بینێژی درەنگە،**

**٣- ئافرەتی بێ مێرد بەتایبەتی بێوەژن کە هاوشانی خۆی هات بۆ خوازبێنی هەتا زوو بیدەی بەشو درەنگە.**

---

٨٧- حديث حسن رواه البخارى في الكبير ١/١٧٧ و احمد في مسنده ١/٢٢٨ والترمذى ١٧١ و ابن ماجه ١٤٨٦ والحاكم ٢/١٦٢ في المستدرك وقال صحيح الاسناد .



## فەرموودەی (٨٦)

**خوای گەورە بەسێ شت ڕازی یە ئەنجامی بدەن،وە سێ شتیشی پێ باش نی یە ئەنجامی بدەن.**

عَـنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَـلَّ يَرْضَى لَكُمْ ثَلاثًا ، وَيَكْرَهُ لَكُمْ ثَلاثـًا ، يَرْضَى لَكُمْ أَنْ تَعْبُدُوهُ وَلا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًـا ، وَأَنْ تَعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلا تفرَّقُوا ، وَيَكْرَهُ لَكُمْ ، قِيلَ وَقَالَ ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ"[٨٨].

**واتـا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**خوای گەورە بەسێ شت ڕازی یە بۆ ئێوە، وە سێ شتیشی پێ باش نییە:**

**ڕازییە لێتان:**

**١- بی پەرستن و بەندایەتی بکەن،**

**٢- وە بەهیچ شێوازێك هاوبەشی بۆ بڕیارمەدەن،**

**٣- هەمووتان دەست بگرن بەدینی خواوە و پارچە پارچە و بەش بەش مەبن،**

**وە خوای گەورە سێ شتیشی پێ باش نی یە ئەنجامی بدەن:**

**١- وتی وتیان، ٢- زۆر پرسیار کردن، ٣- ماڵ بەفیرۆدان.**

---

٨٨- حديث صحيح رواه مسلم رقم ١٧١٥ .



## فەرموودەی (٨٧)

**پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك شـــەوڕەوی پێکرا بۆ ئاســـمان ســـێ شـــتی پێبەخشرا.**

عـن ابن مسعود (رضي الله عنه) قـــال: لَمَّا أُسْـرِيَ بِرَسُــولِ اللَّهِ (ﷺ)، انْتُهِـيَ إِلَى سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى وأعطي ثلاثا: أُعْطِــيَ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ، وَأُعْطِــيَ خَوَاتِيمَ سُــورَةِ الْبَقَرَةِ، وَغُفِرَ لِمَنْ لَمْ يُشْـرِكْ بِاللَّهِ مِنْ أُمَّتِهِ شَيْئًا الْمُقْحِمَاتُ "[٨٩].

**واتا عەبدوڵڵای کوڕی مسعود دەفەرموێ:**

**پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك شـــەوڕەوی پێکرا بۆ ئاســـمان ســـێ شـــتی پێبەخشرا:**

**١- پێنج نوێژە فەرزەکەی پێبەخشرا،**

**٢- کۆتای سورەتی (البقرة)ی پێبەخشرا،**

**٣- وە لێخۆشـــبون بۆ کەسێك کە هاوەڵ و شیرك بۆ خوای گەورە بڕیار نەدات و لەتاوانە گەورەکان دورکەوتبێتەوە کە مرۆڤ بەهۆیانەوە دەڕواتە جەهەنم.**

---

٨٩- حديث صحيح أخرجه مسلم ١/١٥٧ و احمد ١/٣٨٧ .



## فەرموودەی (٨٨)

داوای سێ شتم لەخوای گەورە کرد دوانیانی پێبەخشیم:-

عـن سَعْدِ بْنِ أَبِـي وَقَّاص (رضي الله عنه) قال: قـال رسول الله (ﷺ): سَأَلْتُ رَبِّـي عَزَّ وَجَلَّ ثَلاثًا فَأَعْطَانِي اثْنَـيْنِ وَمَنَعَنِي وَاحِدَةً، سَأَلْتُ رَبِّي أَنْ لا يُهْلِكَ أُمَّتِي بِالْغَـرَقِ وَلا يُهْلِكَهُمْ بِالسِّنَةِ فَفَعَلَ، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لا يَجْعَلَ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ فَمَنَعْنِيهَا "[٩٠].

واتا سـەعدی کوڕی ئەبـی وەقاص (ڕەزای خوای لێ بـێ) ئەگێڕێتەوە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-

داوای سـێ شـتم لەخـوای گـەورە کـرد دوانیانی پێبەخشـیم و لەیەکێکیان بەرگری لێ کردم:-

١- داوام لێکـرد گەلەکەم بەلافاو و نوقم بوون لە ناونەبات ئەمەی پێبەخشیم.

٢- داوام لـێ کـرد گەلەکەم بە سـاڵێ گرانی و قـات و قری لەناو نەبات، ئەم داوایەشی پێبەخشیم.

٣- داوام لـێ کرد ئومەتەکەم دووبەرەکی و ناکۆکیان تێ نەکەوێت ئەم داوایەی لێ وەرنەگرتم و قەدەغەی لێ کردم.

---

٩٠- حیـث صحیـح رواه مسلـم کتاب الفتن و اشـراط والساعة رقـم الحدیث ٢٨٩ واحمد/٣٨٧



## فەرموودەی (٨٩)

**ئەگەر بەڕۆژوو بوویت لەمانگێکدا سێ ڕۆژ بەرۆژووبە:**

عـن أَبي ذَرّ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (ﷺ): "إِذَا صُمْتَ مِنَ الشَّهْرِ ثلاثا، فَصُمْ ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ"(٩١).

**واتا ئەبو زەڕ (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**ئەگەر لەمانگێکدا بەڕۆژوو بوویت سێ ڕۆژ بەرۆژووبە:**

**١- سیازدەی مانگ،**

**٢- چواردەی مانگ،**

**٣- پازدەی مانگ.**

---

٩١- ١) حديث صحيـح رواه الترمـذي ٧٦١ واخرجه النسائـي ٢٢٢ وفي صحيح الجامع الصغير رقم ٦٧٣ .



## فەرموودەی (٩٠)

**گەورەترینی گوناهی گەورە سێ شتە :-**

عن أَبِـي بَكْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَــالَ رَسُولِ اللَّــهِ (ﷺ): "أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْـبَرِ الْكَبَائِرِ ثَلَاثًا، الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُــوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَشَهَادَةُ الزُّورِ، أَوْ قَــوْلُ الزُّورِ"، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّــى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُتَّكِئًا، فَجَلَسَ فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا، حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ[٩٢].

**واتــا ئەبی بەکرە (ڕەزی خوای لــێ بێ) فەرموویەتی : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

**ئایا هەواڵتان بدەمی بەگەورەترینی هەموو تاوانە گەورەکان، ســێ جار ئەمەی لەســەر یەك فەرموو: وتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی:**

**١- هاوبەشی بڕیاردان بۆ خوای گەورە و پەروەردگار،**

**٢- دڵ ڕەنجاندنی باوك و دایك و هەڵشاخان پێیاندا،**

**لەم کاتەدا شانی دادا بوو، جارێك دانیشت و فەرمووی:**

**٣- ئاگاداربن قســەی درۆ و شایەتی درۆ، قسەی درۆ و شایەتی درۆ گەورەترینی تاوانە ئیتر ئەم وشــەیەی ئەوەندە دووبارە کردەوە هەتا بەزەیمان پێیدا هاتەوە و مەترســی ئەوەمــان لێ ئەکرد کە ماندووی بکا، لەبەر ئەوە لەبەر خۆمانەوە دەمان گوت خۆزگە بیدەنگ دەبوو.**

---

٩٢-حديث صحيح رواه البخاري رقم ٥٩٧٦ انظر فتح الباري وفي مختصر البخاري رقم ١١١٩ وأخرجه مسلم في الايمان باب بيان الكبائر واكبرها رقم ٨٧ .



## فەرموودەی (٩١)

**ئەبوو سوفیان ووتی: ئەی پێغەمبەر خوا: سێ شتم پێببخشە:**

عـن أَبي زُمَيْلٍ، حَدَّثَني ابْنُ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: "كَانَ الْمُسْلِمُونَ لَا يَنْظُـرُونَ إِلَى أَبِي سُفْيَانَ وَلَا يُقَاعِدُونَهُ، فَقَالَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ): يَا نَبِيَّ اللَّهِ، ثَـلَاثٌ أَعْطِنِيهِنَّ، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: عِنْدِي أَحْسَنُ الْعَرَبِ وَأَجْمَلُهُ أُمُّ حَبِيبَـةَ بِنْتُ أَبِي سُفْيَـانَ أُزَوِّجُكَهَا؟ قَالَ نَعَمْ، قَـالَ: وَمُعَاوِيَةُ، تَجْعَلُهُ كَاتِبًا بَيْنَ يَدَيْكَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: وَتُؤَمِّرُنِي حَتَّى أُقَاتِلَ الْكُفَّارَ كَمَا كُنْتُ أُقَاتِلُ الْمُسْلِمِينَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ أَبُو زُمَيْلٍ: وَلَوْلَا أَنَّهُ طَلَبَ ذَلِكَ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مَا أَعْطَاهُ ذَلِكَ لِأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ يُسْأَلُ شَيْئًا إِلَّا، قَالَ: نَعَمْ "[٩٣].

**ئەبی زومەیل دەڵێ: عبدوڵڵای کوڕی عەباس (خوای گەورە لەخۆی و باوکی ڕازی بێ) بۆی گێڕامەوە کە موسـڵمانان باش سـەیری ئەبو سـوفیانیان نەدەکرد و لەگەڵیدا دا نەدەنیشـتن تا ئەبو سـوفیان بە پێغەمبەری (ﷺ) وت: ئەی پێغەمبەری خوا! سـێ شـتم پێ ببەخشە فەرمووی: بەڵێ**

**١- وتـی: چاکتریـن و جوانتریـنی ئافرەتی عـەرەب لای منە (أم**

٩٣- حديـث صحيح انظر صحيح مسلم باب فضل ابى سوفيان بن صخر بن حرب رقم ١٦٣٧



حبیبە)ی کچی ئەبو سوفیان دەمەوی خۆم نیکاحی تازە بکەمەوە لێت

فەرمووی: بەڵێ

٢- موعاویەی کوڕیشــم بکەبە نوســەر (کاتب) لەبەردەستی خۆتدا

فەرمووی: بەڵێ

٣- خۆشــم بکە بەســەر لەشــکر چۆن کاتی خۆی لەگەڵ ســوپای موســڵمانان شــەڕم دەکرد ئاواش شــەڕبکەمەوە لەدژی سوپای کافران

فەرمووی: بەڵێ

ئەبو زومەیل ووتی: ئەگەر ئەبو ســوفیان خۆی داوای ئەم شتانەی نەکردایــە پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم) لەخۆیەوە ئەم شــتانەی نەئەدایە چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم) عادەتی وابوو هەرشتێکت لێ داوابکردایە دەیفەرموو: بەڵێ.

## فەرموودەی (٩٢)

**ولاخی بەرز (ئەسپ و ماین ، هێستر ....) بەپێ ی نیازی خاوەنەکەی سێ جۆرە:**

عن أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "الْخَيْلُ لِثَلاثَةٍ: لِرَجُلٍ أَجْرٌ، وَلِرَجُلٍ سِتْرٌ، وَعَلَى رَجُلٍ وِزْرٌ. فَأَمَّا الَّذِي هِيَ لَهُ أَجْرٌ، فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَأَطَالَ لَهَا فِي مَرْجٍ أَوْ رَوْضَةٍ، فَمَا أَصَابَتْ فِي طِيَلِهَا ذَلِكَ مِنَ الْمَرْجِ أَوِ الرَّوْضَةِ كَانَتْ لَهُ حَسَنَاتٍ، وَلَوْ أَنَّهَا قَطَعَتْ طِيَلَهَا فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ كَانَتْ آثَارُهَا وَأَرْوَاثُهَا حَسَنَاتٍ لَهُ، ولو أنها مرت بنهر فشربت ولم يرد أن يسقيها كان ذلك له حسنات فَهِيَ لِذَلِكَ أَجْرٌ، وَرَجُلٌ رَبَطَهَا تَغَنِّيًا وسترا وَتَعَفُّفًا ثُمَّ لَمْ يَنْسَ حَقَّ اللَّهِ فِي رِقَابِهَا وَلا فِي ظُهُورِهَا فَهِيَ لِذَلِكَ سِتْرٌ، وَرَجُلٌ رَبَطَهَا فَخْرًا وَرِيَاءً وَنِوَاءً لأَهْلِ الإِسْلامِ فَهِيَ وِزْرٌ[٩٤].

**واتا ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی:-**

**ولاخی بەرز (ئەسپ و ماین ، هێسر ....) بەپێ ی نیازی خاوەنەکەی سێ جۆرە: بۆ هەندێ پیاو مایەی پاداشت و خێرە، بۆ هەندێ پیاو پەردەو داپۆشەریماڵیەتی، بۆ هەندێ پیاو مایەی تاوان و شەڕ و نەگبەتی یە:**

---

٩٤- حديث صحيح انظر مختصر صحيح البخاري ص: ١٣٤ ج:٢

**١- مایەی پاداشت و خێرە بۆ ئەو کەسەی ڕای دەگرێ بۆ جیهاد و غەزا کردن لەپێناوی خوادا لەبەر ڕەزای خوا، لەمێرگێکا یان لەمێرغوزارێکا بەگوریس دەی بەستێتەوە ئیتر ئەو وڵاخە هەرچی بخوات لەو مێرگ و مێرغــوزارە و چەند بلەوەڕێ لــەو لەوەڕگایە بەژمارەی ئەوە چاکە بۆ خاوەنەکەی دەنوسرێ، یان گوریسەکەی ببچرێنێ و سەرێ یان دوو ســەر غار بکات بەژمارەی تەرســەکانی چاکە و خێــر بۆ خاوەنەکەی دەنوسرێ. وەگریمان لەســەر ئاوێکەوە بردی بەنیازی ئەوەش نا ئاوی بــدا، بەڵام وڵاخەکە لەخۆیەوە دەمی نایە ئاوەکەوەو لێ ی خواردەوە. ئەوە بەقەد ئەندازەی ئەوئاوەی دەیخواتەوە خێری بۆ دەنوسرێ.**

**٢- مایەی پەردە داپۆشینە بۆ کەسێ کەڕای دەگرێ هەتا لەمەردوم بێ نیاز بێ و بۆ ڕوو سوری هەردوو جیهان کار و کەسابەتی پێوە دەکا و، ئەو مافەی خوا لەســەر ئەو وڵاخە دای ناوەکە بریتی یە لەجیهاد کردن، لەســەری فەرامۆش ناکا هەروا مافی وڵاخەکەش فەرامۆش ناکا بۆ ئەم جۆرەکە کەسە پەردەداپۆشەرە.**

**٣- مایەی شــەڕو تاوانیشــە بۆ کەســێ کەڕای دەگرێ بۆ فەخر و ڕوپامای و ڕیا و خۆنواندن و شانازی کردن . بۆ دوژمنایەتی و دژایەتی گەلی ئیسلام بۆ ئەم کەسە مایەی شەڕو تاوانە.**

## فەرموودەی (٩٣)

**تا ئەو سێ شتەم لەیاد بێ بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەر حەق بە عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی قەت قسەی پێ نالێم:**

عن سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رضي الله عنه) قَالَ: "أَمَرَ مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ سَعْدًا، فَقَالَ: مَا مَنَعَكَ أَنْ تَسُبَّ أَبَا التُّرَابِ؟ فَقَالَ: أَمَّا مَا ذَكَرْتُ ثَلَاثًا، قَالَهُنَّ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَلَنْ أَسُبَّهُ لَأَنْ تَكُونَ لِي وَاحِدَةٌ مِنْهُنَّ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَقُولُ لَهُ: خَلَّفَهُ فِي بَعْضِ مَغَازِيهِ، فَقَالَ لَهُ عَلِيٌّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، خَلَّفْتَنِي مَعَ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى، إِلَّا أَنَّهُ لَا نُبُوَّةَ بَعْدِي، وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ يَوْمَ خَيْبَرَ: لَأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ رَجُلًا يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، وَيُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ، قال سعد فَتَطَاوَلْنَا لَهَا، فَقَالَ: ادْعُوا لِي عَلِيًّا، فَأُتِيَ بِهِ أَرْمَدَ فَبَصَقَ فِي عَيْنِهِ، وَدَفَعَ الرَّايَةَ إِلَيْهِ فَفَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِ، وَلَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: فَقُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ الى آخر الآية، سورة آل عمران آية ٦١، دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلِيًّا، وَفَاطِمَةَ، وَحَسَنًا، وَحُسَيْنًا، فَقَالَ: اللَّهُمَّ هَؤُلَاءِ أَهْلِي[٩٥].

**واتا سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص** (ڕەزای خوای لێ بێ) **ئەفەرمووێ:**

**موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان فەرمانی کرد بەسەعد و پێ ی ووت:**

---

٩٥- رواه مسلم في فضائل الصحابة ٢٤٠٤ والترمذي في سننه ٣٧٤٩

ئەوە چی یە وات لێ ئەکات قسە نەڵێی بە علی (أَبا الترابْ) (رەزای خوای لێ بێ).

سەعد ووتی: تا ئەو سێ شتەم لەیاد بێ پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم) دەرحەق بەعلی فەرموو:

قەت قسەی پێ نالێم ئەگەر یەکێك لەو سێ شتەم هەبێت بەلامەوە باشترە لەڕانە وشتریکی سور کە بەلای عەرەبەوە زۆر گرنگە:

١- گوێم لێ بوو پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم) پێ ی فەرموو: لەکاتی غەزایەکدا بەجێی هێڵاو نەیبرد لەگەڵ خۆیدا فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! من لەگەڵ ژن و منداڵدا بەجێ ئەهێڵێ: پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم) فەرمووی: ڕازی نابی بەوەی کەوا تۆ بۆ من وەك هارون وابیت بۆ موسی (علیە السلام) ئەوەندە هەیە دوای من پێغەمبەر نایەت.

٢- گوێم لێ بوو لەڕۆژی خەیبەردا ئەی فەرموو بەیداخەکە ئەدەمە دەست پیاوێك کەوا خوا و پێغەمبەری خۆش ئەوێت، خوا و پێغەمبەریش ئەویان خۆش ئەوێت، سەعد فەرمووی: هەر هەموومان ملمان بۆ درێژ کرد فەرمووی: عەلیم بۆ بانگ بکەن عەلیان بۆ بانگ کرد چاوی ئەیەشا تفی پیرۆزی خۆی تێکرد و چاوی چاك بوویەوە ئینجا بەیداخەکەی دایە دەستی و خوای گەورە خەیبەری لەسەر دەستدا ئازاد کرد.

٣- وە کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی کە ئەفەرمووێ: ئەی موحەمەد (صلی الله علیه وآله وسلم) پێ یان بلێ بەنەصارا ئێمە کوڕەکانمان بانگ ئەکەین ئێوەش

**کورەکانتـــان بانـــگ بکەن ، ژنەکانمان بانگ ئەکەیـــن ژنەکانتان بانگ بکەن هەروەها خۆمان و خۆتان کۆببینەوە لەدوایدا لە خوا بپاڕێینەوە و داوای لـــێ بکەیـــن کەوا لەعنـــەت و نەفرینی خـــوا بکەین لەوانەی درۆزنـــن ، کاتـــێ ئەم ئایەتە دابەزی پێغەمبـــەر (صلی الله علیه وآله وسلم) علی و فاتمە و حەسەن و حوسەینی بانگ کردوو فەرمووی : ئەی پەروەردگار ئەمانە کەس و کار و ئەهلی منن.**

## فەرموودەی (٩٤)

**سێ قسە هەیە هەر کەسێ یەکێکیان بکات درۆیەکی گەورەی بەدەم خواوە کردووە:**

عنْ مَسْرُوقٍ (رضي الله عنه) قال: كُنْتُ متكئا عنْدَ عَائِشَةَ رَضيَ اللَّهُ عَنْهَا، فَقَالَتْ: ثَلاثٌ مَنْ تَكلَّمَ بوَاحدَةٍ منْهُنَّ فَقَدْ أَعْظمَ عَلَى اللَّه الْفرْيَةَ: مَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا رَأَى رَبَّهُ فَقَدْ أَعْظمَ عَلَى اللَّـه الْفرْيَةَ، قَالَ: وَكُنْتُ مُتَّكِئًا فَجَلَسْتُ وَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤمِنينَ، انْظُرِي وَلا تَعْجَلي، أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ: ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾﴾ النجم. ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢٣﴾﴾ التكوير. فَقَالَتْ عَائِشَةُ رَضيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَا أَوَّلُ هَذه الأُمَّة سَأَلْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) عَنْ ذَلكَ، فَقَالَ: "ذَلكَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلامُ، وَلَمْ أَرَهُ في صُورَته الَّتي خُلقَ عَلَيْهَا إلا مَرَّتَيْنِ، رَأَيْتُهُ قَدْ هَبَطَ منَ السَّمَاءِ فَسَدَّ جِسْمُهُ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ". أَلَمْ تَسْمَعْ لِقَوْله تَعَالَى: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾﴾ الأنعام. قَالَ مَسْرُوقٌ: "تَفْسِيرُ هَذِه الآيَة دَليلٌ عَلَى مَا رَوَتْ عَائِشَةُ عَن النَّبِيِّ (ﷺ)، يَقُولُ: ﴿مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾﴾ النجم. ﴿لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾﴾ النجم. ثُمَّ عَادَ الْحَديثُ إِلَى ابْنِ عُلَيَّةَ، فَقَالَ: قَالَتْ عَائشَةُ رَضيَ اللَّهُ عَنْهَا: وَمَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا (ﷺ) لَمْ يُبَلِّغْ مَا أُنْزلَ إِلَيْه منْ رَبِّه فَقَدْ أَعْظمَ عَلَى اللَّه الْفرْيَةَ، لأَنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴿٦٧﴾﴾ المائدة. وَمَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا يَعْلَمُ

مَـا في غدٍ فقدْ أعْظـمَ عَلى اللهِ الفِرْيَةَ، لأَنَّ اللَّـهَ تَعالَى يَقُولُ: ﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ٦٥﴾ النمل "(٩٦).

واتا مەســروق فەرموویەتــی: لای عائیشــە (ڕەزای خوا لەخۆی و باوکی بێ) شانم دادا بوو فەرمووی: هەر کەسێ یەکێ لەم سێ قسەیە بکات ئەوە بەڕاستی درۆیەکی گەورەی بەدەم خواوە کردووە:

١- هەر کەسێ بڕوای وابێت و گومان وا ببات کەوا پێغەمبەر (ﷺ) پەروەردگاری بینیوە ئەوە بەڕاســتی درۆیەکــی گەورەی بەدەم خواوە کردووە (مسروق) فەرمووی: لەکاتی ئەم قسانەدا شانم دادا بوو ئینجا ڕاســت بومەوە و ڕێك دانیشــتم وتم ئەی دایکی ئیمان داران! مۆڵەتم بــدە و پەلــەم لێ مەکە ئەی ئــەوە نی یە خوای گــەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ﴾ واتــە بەراســتی بۆ دووەم جــاری بینی یەوە وەدەفەرمــوێ ﴿وَلَقَدۡ رَءَاهُ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡمُبِينِ﴾ واتە بەچاوی ســەرلەکەناری ئاسماندا ئەوم بینی و چاوم پێکەوت کەواتە تۆ چۆن ئەڵێی نەی بینی وە (عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی:

من خۆم یەکەم کەس بووم ئەم پرسیارەم کرد لەپێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئــەوەی مــن بینیومە جوبرەئیــل بووە، نەم بینیــوە تەنیا ئەو دوو جارە نەبێ لەســەر شــێ وەی خــۆی بینیومە، کە خوای گــەورە یەکەم جار دروســتی کردووە بینیم لەئاســمانەوە دا ئەبەزی لاشــەی ئەوەندە

---

٩٦- حديث صحيح أخرجة البخاري ٣٢٣٨ ومسلم رقم ٢٨٧



گەورەبوو مابەینی ئاسمان و زەوی داگیر کردبوو عائیشە فەرمووی ئەی نەت بیستووە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ ۖ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ﴾ مەسـروق ئەفەرموێ: ڕاڤەی ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی عائیشە ڕیوایەتی کردووە، فەرموویەتی: (مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى) واتا: ئەوەی محمد (ﷺ) بـە چاوی بینی دڵی بڕوای پێکرد و بەدرۆی نەزانی ﴿ لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى ﴿١٨﴾ ﴾ النجم

واتە: سـوێند بەخوا بێگومان پیغەمبەر (ﷺ) لەو شەوەدا بەڵگە و نیشـانە و موعجیزە گەورەکانی پەروەردگاری بینی و بەچاوی سـەری بە هەموو هەستێ

پاشان فەرموودەکە ئەگێڕێتەوە فەرموویەتی: عائیشە فەرموویەتی:

٢- وەهەر کەسێ وا گومان ببات کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەی لەلایەن خواوە بۆی هاتووە شاردویێتەوە و نەی گەیاندوە ئەوە بەڕاستی درۆیەکی گەورەی بەدەم خواوە کردووە چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿ يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ﴾ واتـە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بیگەیـنە ئـەوەی بۆت دابەزیوە لەلایـەن پەروەردگارتەوە ئەگەر نەی گەینی ئەوە پەیامەکەت نەگەیاندووە.

٣- وە هەر کەسـێ وا گومان ببات کـەوا پێغەمبەر (ﷺ) ئەزانێ بەیانی چی ڕوو ئەدات بەڕاستی درۆیەکی گەورەی بەدەم خواوە کردووە خوای گەورە خۆی دەفەرموێ:

﴿ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ ﴿٦٥﴾ ﴾ النمل



## فەرموودەی (٩٥)

**کاتێك گەشتن بەدوژمنەکانتان لەهاوبەش بڕیار دەرەکان (المشرکین) بانگیان بکەن بۆ سەر سێ شت:**

عـن بريدة (رضي الله عنه) قال: كان رسول الله (صلى الله عليه وآله وسلم) إذا أمر أميرا على جيش أو سرية أوصاه في خاصته بتقوى الله ومن معه من المسلمين خـيرا ثم قال اغزوا باسـم الله في سبيل الله قاتلـوا من كفر بالله اغزوا ولا تغلـوا ولا تغدروا ولا تمثلوا ولا تقتلوا وليدا وإذا لقيت عدوك من المشركـين فادعهم إلى ثلاث خصال أو خلال فأيتهن ما أجابوك فاقبل منهم وكف عنهم ثم ادعهم إلى الإسلام فإن أجابوك فاقبـل منهم وكـف عنهم ثم ادعهم إلى التحول مـن دارهم إلى دار المهاجرين وأخبرهم أنهم إن فعلوا ذلك فلهم ما للمهاجرين وعليهم مـا علـى المهاجرين فـإن أبوا أن يتحولـوا منهـا فأخبرهم أنهم يكونون كأعـراب المسلمين يجري عليهم حكم الله الذي يجري على المؤمنين ولا يكون لهم في الغنيمة والفيء شيء إلا أن يجاهدوا مع المسلمـين فإن هم أبوا فسلهم الجزية فـإن هم أجابوك فاقبل منهم وكـف عنهم فإن هم أبوا فاستعن بالله وقاتلهم وإذا حاصرت أهل حصـن فأرادوك أن تجعل لهـم ذمة الله وذمة نبيـه فلا تجعل لهم ذمـة الله ولا ذمة نبيه ولكن اجعـل لهم ذمتك وذمة أصحابك فإنكم أن تخفـروا ذممكم وذمم أصحابكم أهـون من أن تخفروا ذمة الله وذمـة رسوله وإذا حاصرت أهل حصن فـأرادوك أن تنزلهم على

حكم اللــه فلا تنزلهم على حكم الله ولكن أنزلهم على حكمك فإنك لا تدري أتصيب حكم الله فيهم أم لا(٩٧).

واتا ابو بورەیدە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمویەتی: هەرکاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرکردەیەکی دابنایە لەسەر سوپایەك یان هێزێك ئامۆژگاری دەکردن بەترسان لەخوا بەتایبەتی سەرکردەکەیانی ئامۆژگاری دەکرد بەچاك ڕەفتار کردن لەگەڵ ئەو موسڵمانانەی کەلەگەڵیدان دەیفەرموو: بەناوی خواوە، لەڕێگەی خوادا غەزا بکەن شــەڕ بکەن لەگەڵ ئەوانەی باوەڕیــان بەخوا نی یە، دیســان فەرمووی: غــەزا بکەن، پێش ئەوەی غەنیمەت دابەش بکرێت هیچی لێ لامەدەن، غەدر مەکەن، لوت و گوێ مەبڕن منــداڵ مەکوژن. کاتێك گەشــیتن بەدوژمنەکانتان لەهاوبەش بریاردەرەکان (المشرکین) بانگیان بکەن بۆ سەر سێ شت، لەو سێ شتە هــەر کامیان وەلام دایەوە لێ یان وەر بگرن دەســت درێژیان مەکەنە سەر:

١- بانگیــان بکە بۆ ئیســلام ئەگــەر وەڵامیان دایەوە و موســڵمان بوون لێ یان وەربگرە،وازیان لێ بهینە، پاشــان بانگیان بکە لە شوێنی خۆیانەوە بگوێزنەوە بۆ شوێنی کۆچەران کە مەدینەیە، وە هەواڵیشیان بدەرێ ئەگەر ئەمە بکەن لەخێر و قازانجدا و لەئەرك و واجبدا وەك کۆچــەران وان وە ئەگەر گواســتنەوەیان قبوڵ نەکرد هەواڵیان بدەرێ

---

٩٧- (١) حديث صحيح أنظر مختصر صحيح مسلم رقم ١١١١ كتاب السير



کە وەك عەرەبی دەشـــتەکین کە لەدەرەوەی مەدینەن و موســڵمانن وە ئەو فەرمانەی بەســەر موسڵماناندا ئەدرێت بەسەر ئەوانیشدا دەدرێت ولە غەنیمەت[٩٨] فەیئیشــدا[٩٩] هیچ بەشــێکیان نــی یە مەگەر لەگەڵ موسڵماناندا غەزا بکەن.

٢- ئەگەر ئیسلامەتیان قبوڵ نەکرد ، داوای سەرانە (الجزیە) یان لێ بکــەن ئەگەر قبوڵیان کرد تــۆش لێیان وەربگرە و وازیان لێ بهێنە وە ئەگەر قبوڵیشیان نەکرد پشت بەخوا ببەستە و شەڕیان لەگەڵدا بکە.

٣- وە ئەگەر چوار دەوری قەڵایەکەت دا، خەڵکەکەی داوای ئەوەیان لێ کردی کە بەپەیمانی خواو پێغەمبەری خوا پەیمانیان لەگەڵدا ببەستێت پەیمانیــان لەگەڵدا مەبەســتە، بەڵکو بە بەڵێنی خــۆت و هەواڵەکانت بەڵێنیان لەگەڵدا ببەستە، چونکە جاری وا هەیە هەندێك لەناکەسەکانیان بەڵێن و پەیمان هەڵدەوەشــێنەوە، لەبەر ئەوە هەڵوەشاندنەوەی بەڵێنی تــۆ و هەوەڵەکانــت ئاســان تــرە لــە هەڵوەشــاندنەوەی بەڵێنی خواو پێغەمبەرەکــەی (ﷺ) وە ئەگەر چوار دەوری قەڵایەکتدا داوای ئەوەیان لــێ کردیت کە حوکمی خوا بدەیت بەســەریانا، پاشــان بینە خوارەوە داواکەیــان قبوڵ مەکە بەڵکو لەســەر حوکم و بڕیــاری خۆت بیانهێنە خوارەوە چونکە تۆ نازانی حوکمی خوات پێکاوە لە بارەیانەوە یان نا.

## فەرموودەی (٩٦)

---

٩٨- غەنیمەت:بەو ماڵە دەوترێت موسڵمانان بە شەڕ و غەزا دەیگرن

٩٩- فییء: بەو ماڵە دەوترێت کە موسڵمانان بەبێ شەڕ و غەزا دەیگرن

**ئیبراهیم (علیه السلام) قەت درۆی نەکردوە تەنها سێ درۆ نەبێت:**

عـن أبي هريـرة (رضي الله عنه) قال: قــال رسول اللــه (ﷺ): لم يكذب إبراهيــم النبــي عليه السلام قــط إلا ثلاث كذبات ثنتــين في ذات الله قولــه إني سقيم وقوله بل فعله كبيرهم هــذا وواحدة في شأن سارة فإنه قدم أرض جبار ومعه سارة وكانت أحسن الناس فقال لها إن هــذا الجبار إن يعلم أنك امرأتي يغلبني عليك فإن سألك فأخبريه أنك أختي فإنك أختي في الإسلام فــإني لا أعلم في الأرض مسلما غيري وغــيرك فلما دخــل أرضه رآها بعض أهل الجبــار أتاه فقال له لقد قدم أرضك امرأة لا ينبغي لها أن تكون إلا لك فأرسل إليها فأتي بها فقــام إبراهيم عليه السلام إلى الصلاة فلمــا دخلت عليه لم يتمالك أن بسط يده إليها فقبضــت يده قبضة شديدة فقال لها ادعي الله أن يطلق يدي ولا أضرك ففعلت فعاد فقبضت أشد من القبضة الأولى فقال لها مثل ذلك ففعلت فعاد فقبضــت أشد من القبضتين الأوليين فقال ادعي الله أن يطلق يدي فلك الله أن لا أضرك ففعلت وأطلقت يده ودعا الذي جاء بها فقال له إنك إنما أتيتني بشيطان ولم تأتني بإنسان فأخرجها مـن أرضي وأعطها هاجر قال فأقبلت تمشي فلما رآها إبراهيم عليه السلام انصرف فقال لها مهيم قالت خيرا كف الله يد الفاجر وأخدم خادما قال أبو هريرة فتلك أمكم يا بني ماء السماء[١٠٠].

**واتــا ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە**

---

١٠٠- حديث صحيح رواه البخاري رقم ٣١٧٩ وفي مختصر صحيح مسلم رقم ١٥٣٥



(ﷺ) فەرموویەتی:-

ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام) هەرگیز قەت درۆی نەکردوە تەنیا سێ درۆ نەبێ دوانیان ساغ لەبەر ڕەزامەندی خودا بوو:

١- یەکەم کاتێ قەومەکەی چونەدەرەوە بۆ جەژن ئەو بۆ خاتری ئەوەی بتەکان بشکێنێ وتی من نەخۆشم لەگەڵیان نەچوو مایەوە و بتەکانی شکاند.

٢- کاتێ بتەکانی شکاند وتیان تۆ شکاندوتە؟ فەرمووی: گەورەکەیان شکاندوویەتی.

٣- سێیەمیش سەبارەت بە سارا بوو کە فەرمووی : خوشکمە چونکە جارێك ابراهیم (علیه السلام) "سارا"ی لەگەڵ بوو ڕۆیشتە شوێنێك پاشایەکی ستەم کاری لێ بوو، ساراش جوانترینی کەس بوو ابراهیم (علیه السلام) پێ ی وت:

ئەم ستەم کارە ئەگەر بزانی تۆ خێزانی منی تۆم لێ داگیر ئەکا ئەگەر پرسیاری لێ کردی پێ ی بڵێ: من خوشکی ئەوم چونکە تۆ خوشکی منی لەئیسلامدا من لەسەر ڕوی زەویدا موسڵمانێکی تر شك نابەم بێجگە لە تۆ، کاتێ گەشتنە ئەو خاکە هەندێ لەپیاوانی ئەو ستەم کارە چاویان بە سارا کەوت هاتن و هەواڵیان هێنا بۆ ستەم کارەکە و پێیان وت: ئافرەتێ هاتۆتە خاکی تۆوە بۆتۆ نەبێ بەکەس لایەق نی یە ناردی بە شوینیا هینایانە لای ئیبراهیم (علیه السلام) دەستی کرد بەنوێژ کردن، کە سارا خاتوون چوە لای ستەم

کارەکە خۆی پیرانەگیراو دەســتی بۆ درێژ کرد دەستی وشك بوو زۆر بەشــیدەت! پیَ ی وت: دوعام لەلای خوا بۆ بکە دەستم بەرەلابیَ هیچ زەرەرت پیَ ناگەینم.

دوعای بۆ کرد و دەســتی بەرەڵا بوو، دووبارە دەســتی بۆ بردەوە دەســتی لەجاری پێشوو زیاتر وشــك بوو دوبارە پیَ ی وت: دوعام بۆ بکە دەســتم بەرەڵابیَ هیچ زەرەرم بۆت نابیَ، دوعای بۆکرد و دەستی بەربوو دیسان دەستی بۆ بردەوە لەجاری یەکەم و دووەم زیاتر دەستی ووشك بوو پیَ ی وت:

دوعــام بۆ بکە خوا لەبەینمابــیَ زەرەرم بۆت نەبیَ دوعای بۆ کرد دەســتی بەربــوو بانگــی ئەوەی کرد کــە بۆی هێنابوو پــیَ ی ووت : تۆ مرۆڤت بۆ نەهێناوم بەڵکو شــەیتانیکت بــۆ هێناوم! لەئەرزی من بیکەنــە دەرەوە و هاجــەری بدرەیَ فەرمووی: ســارا خاتوون دەرچوو رۆشــت گەڕایەوە بــۆ لای ئیبراهیــم پێغەمبەر (علیه الســلام) کاتیَ بینــی نوێژەکەی تەواو کرد (مُهیَم) واتە چی رویدا لێت ووتی: خێرە خوا دەســتی ئەو تاوان کارەی گرت خزمەت کارێکی شــی پێبەخشیم. ئەبــو هورەیرە ئەفەرمووێ: ئەی نەوەکانی ئاوی ئاســمان ئەوە دایکی ئێوەیە (چونکە هەر لە صەحرا و دەشــتا بوون و هەر ئاوی بارانیان، خواردۆتەوە، بەمنداڵی هاجەر دەڵێن: نەوەکانی ئاوی ئاسمان.

## فەرموودەی (٩٧)

**لەبارەی سـێ شـتەوە پرسیارت لێ دەکەم کەسـێ پێغەمبەر نەبێ نایزانێ.**

عـن أنـس (رضي الله عنه) قال: بلغ عبـد الله بن سلام مقـدم رسول الله (ﷺ) المدينة فأتاه فقـال إني سائلك عن ثلاث لا يعلمهن إلا نبي قال ما أول أشراط الساعة وما أول طعام يأكله أهل الجنة ومن أي شيء ينـزع الولد إلى أبيه ومن أي شيء ينزع إلى أخواله فقال رسول الله (ﷺ) خـبرني بهن آنفا جبريل قال فقال عبد الله ذاك عدو اليهود من الملائكـة فقال رسول الله (ﷺ) أمـا أول أشراط الساعة فنار تحشر النـاس من المشرق إلى المغـرب وأما أول طعام يأكلـه أهل الجنة فزيـادة كبد حوت وأما الشبه في الولد فـإن الرجل إذا غشي المرأة فسبقها ماؤه كان الشبه له وإذا سبق ماؤها كان الشبه لها قال أشهد أنـك رسول الله ثم قال يا رسول اللـه إن اليهود قوم بهت إن علموا بإسلامي قبل أن تسألهم بهتوني عندك فجاءت اليهود ودخل عبد الله البيـت فقال رسول الله (ﷺ) أي رجل فيكـم عبد الله بن سلام قالوا أعلمنـا وابن أعلمنا وأخيرنـا وابن أخيرنا فقـال رسول الله (ﷺ) أفرأيتـم إن أسلم عبد اللـه قالوا أعاذه الله من ذلـك فخرج عبد الله إليهـم فقال أشهـد أن لا إله - إلا الله وأشهـد أن محمدا رسول الله فقالوا شرنا وابن شرنا ووقعوا فيه[١٠١].

---

١٠١- حديث صحيح رواه البخاري رقم ٣٣٢٩ أنظر فتح الباري ومسلم أنظر صحيح

**واتا ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی : عبدوڵڵای کوڕی سەلام (ڕەزای خوای لێ بێ) کاتێ دەنگ و باسی پێگەیشت کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی کردووە بۆ مەدینە گەیشتۆتە مەدینە ، جا دەچێ بۆ خزمەتی و پێ ی دەفەرموێ : من لەبارەی سێ شتەوە پرسیارت لێ دەکەم کە سێ پێغەمبەر نەبێ نایزانێ فەرمووی:**

**١- یەکەم نیشانەی ڕۆژی دوایی کامەیە؟**

**٢- یەکەم خواردنی خەڵکی بەهەشت دەیخۆن چ خواردنێکە؟**

**٣- هۆی چیە منداڵ هەندێ جار شێوەی لەباوکێتی و هەندێ جار لەدایکی و دەچێتە سەر خاڵۆوانی؟**

**پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: جیبرائیل (علیه السلام) ئا ئێستا هەواڵی ئەم سێ پرسیارەی بۆ هێنام،**

**عبدوڵڵا فەرمووی: جولەکە لەناو خۆیان لەناو هەموو فریشتەکانا زیاتر (جیبرائیل) بە دوژمنی خۆیان دەزانن ، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:**

**١- یەکەم نیشانەی ڕۆژی دوای ئاگرێکە خەڵك لەڕۆژهەڵهاتەوە دەداتەبەر،بەرەو ڕۆژئاوا،**

**٢- یەکەم خۆراکی بەهەشتیەکانیش دەیخۆن زیادە گۆشتێکە کە بەجگەری نەهەنگەوەیە.**

**٣- ئاوی پیاویش ئەگەر پێش ئاوی ژن کەوت منداڵەکە ڕادەکیشێتە**

---

مسلم بشرح النووي ج ٣ ص ٢٢٢ ، وفي سلسلة الاحاديث الصحيحة ٣٤٩٧

سـەر شـێوازی خۆی ، بـەڵام ئەگەر ئاوی ژن پێش ئـاوی پیاو کەوت مندالەکە رادەکێشێتە سەر شێوازی خۆی یان خالۆوانی.

عەبدوڵـلا (ڕەزای خوا لێ بێ) کاتێ زانی پێغەمبەر (ﷺ) راسـت دەکات فەرمووی: شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری خوای،

پاشان عەبدوڵلا فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! جولەکە هۆزێکی بوهتـان کەر و درۆزن و قسـە هەڵبەسـتن لەپێش ئـەوەدا بزانن من موسڵمان بووم پرسیاری ماڵی من یان لێ بکە چونکە ئەگەر بزانن من موسڵمان بووم بوهتانم بۆ دەکەن.

جـا کاتێ جولەکەکان هاتن عەبدوڵلا چووە ماڵەوە خۆی شـاردەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێیـان: عەبدوڵلا چۆن پیاوێکە لەناوتاندا ووتیـان : زاناترینی ئێمەیـە و کوڕی زاناتریـنی ئێمەیە، چاکترینی ئێمەیە و کوڕی چاکترینی ئێمەیە، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی:

باشـە پێم بڵێن: ئەگەر عەبدوڵلا موسـڵمان ببێ ئێوە دەڵێن چی؟ وتیان: خوا پەنای بدا لەشـتی وا ئینجـا عەبدوڵلا لەماڵ هاتەدەرەوە ووتـی : (أشهـد أن لا الـه الا اللـه و أشهـد أن محمداً رسـول الله) جولەکـەکان وتیان عبدوڵـلا خراپترینی ئێمەیە کـوڕی خراپترینی ئێمەیە و دەستیان کرد بەقسەی ناشرین پێ وتنی.

## فەرموودەی (٩٨)

**لەپیشکەدا کەس قسەی نەکردووە سێ کەس نەبێ:**

عـن أبي هريرة (رضي الله عنه)، عن النبي (صلى الله عليه وآله وسلم) قــال: (لَمْ يَتَكَلَّمْ في المَهْدِ إِلَّا ثَلاثَــةٌ: عِيسَى. وَكَانَ في بَنِــي إِسْرَائِيلَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ جُرَيْجٌ، كَانَ يُصَلِّــي، جَاءَتْهُ أُمُّهُ فَدَعَتْهُ، فَقَــالَ: أُجِيبُهَا أَوْ أُصَلِّــي، فَقَالَتْ: اللَّهُمَّ لاَ تُمِتْــهُ حَتَّى تُرِيَــهُ وُجُوهَ المُومِسَــاتِ، وَكَانَ جُرَيْــجٌ في صَوْمَعَتِهِ، فَتَعَرَّضَــتْ لَهُ امْرَأَةٌ وَكَلَّمَتْــهُ فَأَبَى، فَأَتَتْ رَاعِيًــا فَأَمْكَنَتْهُ مِنْ نَفْسِهَا، فَوَلَدَتْ غُلاَمًا، فَقَالَتْ: مِنْ جُرَيْــجٍ، فَأَتَوْهُ فَكَسَرُوا صَوْمَعَتَهُ وَأَنْزَلُوهُ وَسَبُّوهُ، فَتَوَضَّأَ وَصَلَّى ثُمَّ أَتَى الغُلاَمَ، فَقَالَ: مَنْ أَبُوكَ يَا غُلاَمُ؟ قَالَ الرَّاعِي. قَالُوا: نَبْنِي صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ؟ قَالَ: لاَ إِلَّا مِنْ طِينٍ. وَكَانَتِ امْرَأَةٌ تُرْضِعُ ابْنًا لَهَا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَمَرَّ بِهَا رَجُلٌ رَاكِبٌ ذُو شَارَةٍ فَقَالَتْ: اللَّهُمَّ اجْعَلِ ابْنِي مِثْلَهُ، فَتَرَكَ ثَدْيَهَا وَأَقْبَلَ عَلَى الرَّاكِبِ، فَقَالَ: اللَّهُــمَّ لاَ تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ، ثُمَّ أَقْبَــلَ عَلَى ثَدْيِهَا يَمَصُّهُ، قَــالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمَصُّ إِصْبَعَهُ، ثُمَّ مُرَّ بِأَمَةٍ، فَقَالَتْ: اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلِ ابْنِي مِثْلَ هَذِهِ، فَتَرَكَ ثَدْيَهَا، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا، فَقَالَتْ: لِمَ ذَاكَ؟ فَقَالَ: الرَّاكِبُ جَبَّارٌ مِنَ الجَبَابِرَةِ، وَهَذِهِ الأَمَةُ يَقُولُونَ: سَرَقْتِ، زَنَيْتِ، وَلَمْ تَفْعَلْ)[١٠٢].

**واتـــا ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێ بێ) **ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وآله وسلم) فەرموویەتی:-**

---

١٠٢- حديث صحيح رواه البخاري ٥/٤١٣ ومسلم ٩/٤٤٣



**سێ کەس نەبێ کەسی تر لەبێشکەدا قسەی نەکردووە.**

**١- عیسای کوڕی مەرییەم (علیه السلام)**

**٢- هاوڕێکەی جوریج، پیاوێ دەبێ لەنەوەی ئیسرائیل ناوی جوریج دەبێ، خواناسێکی باش دەبێ، شوێنێکی تایبەت دەکات بۆ خوا پەرستی، جارێــك نوێــژ دەکا، لەوکاتەدا دایکی دێت بۆ لای و بانگی دەکات ئەی جورەیــج! ئەویش لە دڵی خۆیــدا دەڵێ: خودایە! نازانم وەڵامی دایکم بدەمــەوە، یــان نوێژەکەم تەواو بکەم، لەپاشــان وای  بە باش دەزانی نوێژەکەی تەواو بکات وەڵامی  دایکی نەداتەوە. دایکیشی دەگەرێتەوە، بۆ ســبەینێ کەدێتەوە جۆریج هەر خەریکــی نوێژکردن دەبێ بانگی دەکا و دەڵــێ جوریج: جورەیجیش دەفەرمووێ: خودایە نازانم وەڵامی دایکــم بدەمەوە یان نوێژەکەم تەواو بکەم لەپاشــان وا بەباش دەزانێ کە نوێژەکەی تەواو بکا، دایکیشی دەڵێ:**

**خودایــە: نەیمرێنی هەتا ڕووی  داوینپیســانی پێ نیشــان دەدەی. بەردەوام جورەیج لەشوێنی خودا پەرستیەکەیدا بوو، ئافرەتێکی دواین پیس کە زۆر جوان بوو ووتی: من لەخشــتەی دەبەم وتوشــی فیتنەی دەکــەم، جا ژنەکە دەچێ بۆ لای گەلێ خەریك دەبێ لەگەڵایدا تاکاری ناشــەرعی و زینــای لەگڵدا بــکا، بەڵام جورەیج مل نــادا و ئاوڕی لێ ناداتــەوە، جــا ژنەکە نا ئومێــد دەبێ، دەچێ بۆ لای شــوانێ، لەگەڵا ئەو شــوانەدا کاری ناشــەرعی و زینا ئەنجام ئەدا ئینجا دەڕواتەوە و پاش ماوەیەك ســکی پڕ دەبێ و کوڕێکی دەبێ لەو شوانە و دەڵێ: ئەم**

**منداڵــەم لە جورەیجە! کــەس و کاری ژنە داوێن پیســەکە دەچن بۆ گیانی جورەیج و لەشــوێنی خوا پەرستیەکەی دەری دەهێنن و شوێنی خوا پەرســتیەکەی دەروخێنن و خۆشــی تێر و پڕ فەلاقەی دەکەن و دەیدەنــە بەرجمێــن، ئەویش دەفەرمووێ: ئــەوە چیتانە بۆ وا لەمن دەکــەن، گوناهم چی یە؟ دەڵێن چونکە تۆ ئیشــی خراپت لەگەڵ ئەم ئافرەتــەدا کردووە ئەو منداڵەی لــە تۆ بووە، جۆرەیج دەڵــێ مۆڵەتم بدەن تا دەســت نوێژێك بگرم و نوێژ بکەم ئینجا منداڵەکەم بۆ بێنن بەو شێوازەی کردوو منداڵەکەیان بۆ هێنا، جورەیج ووتی: بەمنداڵەکە باوکی تۆ کێیە؟ کورەکەش دێتە زمان دەڵــێ: باوکی من فیسارە شوانە!:**

**جا ئەوســا خەڵکەکە لەڕاستی ڕووداوەکە تێدەگەن و داوای لێ بوردن لــە جۆرەیج دەکەن ودەڵێن خانووەکەت لەزێر بۆ دروســت دەکەینەوە؟ جۆرەیج یش دەڵێ: نەخێر لەقوڕ وەك جارانی خۆی بۆم دروست کەنەوە.**

**٣- سێیەم منداڵ لەبیشکەدا قسەی کردووە جارێ بووە ژنێك مەمکی دەدا بــە منداڵەکەی کەلەنەوەی ئیســرائیل بوو، لەوکاتەدا ســوارێکی جــوان پێکەوتوو و قــۆز و بەناوبانگ بەلایدا تێ دەپەڕێ، بەســواری وڵاخێکــی کەشــخە، ژنەکە دەڵــێ: خودایە! ئەم کــوڕەی منیش بکەی بەسوار چاکێکی ئاوا قۆزو بەناوبانگ!**

**جاکوڕەکە مەمکی دایکی بەرداو ووتی: خوایە! وەك ئەوم لێ نەکەی! ئینجا دیسان مەمکەکەی دەگرێتەوە و دەست دەکاتەوە بەمژینی.**

**ئەبــو هورەیــرە** (ڕەزای خوای لێ بــێ) **دەیفەرموو: دەڵــێ ی وا لەبەر**



چاومە کە چۆن چۆنی پێغەمبەرەوە (ﷺ) پەنجەی دەمژێ و لاسای مەمکە خواردنی منداڵەکەی دەکردەوە.

پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: لەپاشان کەنیزەکێکیان هێناو هێنابوویانە گیر وگاز ولێیان دەدا و دەیانگوت: داوێن پیسی و دزیت کردووە ئەویش هەر دەیگووت:

(حسبی الله و نعم الوكيل) من هەر خودام هەیە کەکەسم بێ و بەسم بێ! بەڕاستی خوا پشتیوانی چاکە. جا دایکی منداڵەکە دەڵێ:

خودایە! ئەم کوڕەی من وەك ئەم کچە بەم دەردەنەبەی دیسان کوڕەکە مەمکەی دایکی بەرداو تەماشایەکی کچەکەی کردەوە و ووتی: خودایە وەك ئەم کچەم لێ بکە،

دایکی ووتی: بەمنداڵەکە من گوتم خودایە! کوڕەکەم پیاوێکی وەك ئەمەی لێ دەرچێ سوارچاك بەناوبانگ کەچی تۆ وتت خودایە نەمکەی بەپیاوێکی ئاوا. لەپاشان کەنیزەکیکیان بەلێدان و تیهەڵدان هێنا و پێیان دەوت داوێن پیسی و دزیت کردوو. منیش وتم خوایە کوڕەکەم وەك ئەم ئافرەتە لێ نەکەی، کوڕەکەی ووتی خوایە وەك ئەم ئافرەتەم لێ بکەی منداڵەکە ووتی بەدایکی: چونکە سوارەکە زۆر دارێکە لەزۆر دارەکان مل هوڕیکە لەمل هوڕەکان لەبەر ئەوە وتم: خوایە نەم کەی بە پیاوێکی وا ستەم کار، بەڵام کەنیزەکەکە پێیدەڵێن داوێن پیسی و دزیت کردووە ئەویش پاك بێ گەردو و بێ تاوانە نەدزی کردووە و نەداوین پیسی بۆیە وتم خوایە وەك ئەم ئافرەتە بێ تاوانەم لێ بکەی.



## فەرموودەی (٩٩)

**سـێ کەس لەنەوەی ئیسـرائیل بەڵەکێك و کەچەڵـێك و کوێرێك خوای گەورە ویستی تاقی یان بکاتەوە.**

عـن أبي هريرة (رضي الله عنه)، أنه سمع رسول الله (ﷺ) يقول إن ثلاثة في بنـي إسرائيـل أبرص وأقرع وأعمى بدا الله عـز وجل أن يبتليهم فبعـث إليهم ملكا فأتـى الأبرص فقال أي شيء أحـب إليك قال لون حسن وجلد حسن قد قذرني الناس قال فمسحه فذهب عنه فأعطي لونا حسنا وجلدا حسنا فقـال أي المال أحب إليك قال الإبل أو قال البقر هـو شك في ذلك إن الأبرص والأقرع قال أحدهما الإبل وقال الآخر البقر فأعطي ناقة عشراء فقال يبارك لك فيها وأتى الأقرع فقال أي شيء أحب إليك قال شعر حسن ويذهب عني هذا قد قذرني الناس قال فمسحه فذهب وأعطي شعرا حسنا قال فأي المال أحب إليك قال البقر قـال فأعطاه بقرة حاملا وقال يبارك لك فيها وأتى الأعمى فقال أي شيء أحب إليك قال يرد الله إلي بصري فأبصر به الناس قال فمسحه فرد الله إليه بصره قـال فأي المال أحب إليك قال الغنم فأعطاه شاة والدا فأنتج هذان وولد هذا فكان لهذا واد من إبل ولهذا واد من بقر ولهـذا واد من غنم ثـم إنه أتى ، الأبرصـ في صورته وهيئته فقال رجـل مسكين تقطعت بي الحبـال في سفري فلا بلاغ اليـوم إلا بالله ثـم بك أسألك بالذي أعطاك اللون الحسن والجلد الحسن والمال بعيرا أتبلـغ عليه في سفري فقال لـه إن الحقوق كثيرة فقال له كأني أعرفك

ألم تكن أبرص يقذرك الناس فقيرا فأعطاك الله فقال لقد ورثت لكابر عن كابر فقال إن كنت كاذبا فصيرك الله إلى ما كنت وأتى الأقرع في صورته وهيئته فقال له مثل ما قال لهذا فرد عليه مثل ما رد عليه هذا فقال إن كنت كاذبا فصيرك الله إلى ما كنت وأتى الأعمى في صورته فقال رجل مسكين وابن سبيل وتقطعت بي الحبال في سفري فلا بلاغ اليوم إلا بالله ثم بك أسألك بالذي رد عليك بصرك شاة أتبلغ بها في سفري فقال قد كنت أعمى فرد الله بصري وفقيرا فقد أغناني فخذ ما شئت فوالله لا أجهدك اليوم بشيء أخذته لله فقال أمسك مالك فإنما ابتليتم فقد رضي الله عنك وسخط على صاحبيك(١٠٣).

واتا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی:

بەگوێی خۆم لەدەمی پێغەمبەرم (صلى الله عليه وآله وسلم) بیست دەیفەرموو:

سێ کەس لەنەوەی ئیسرائیل بەڵەکێك و کەچەڵێك و کوێرێك خوای گەورە ویستی تاقییان بکاتەوە مەلائیکەیەك لەسەر شێوەی پیاوێ دەنێرێ بۆلایان ١- مەلائیکەکە دەچێتە لای بەڵەکەکە و پێی دەڵێ: زیاتر حەزت لەچی یە؟ دەڵێ: حەزم لەڕەنگ و بۆیەکی جوان و پێستێکی جوانە و ئەم بەڵەکییەشم نەمێنێ کە بەهۆیەوە خەڵك قیزم لێ دەکەنەوە.

مەلائیکەکە دەست دەهێنێ بەسەر لاشەیدا ئیتر بەویستی خوای

---

١٠٣- حديث صحيح رواه البخاري رقم ١٣٨٢ و أخرجه مسلم في كتاب الذهد والرقائق ٢٩٩٤

گەورە بەڵەکییەکەی نامێنێ، ڕەنگ و بۆیەکی جوان و پێستێکی جوانی پێدەبەخشرێ، ئینجا مەلائیکەکە پێی دەڵێ حەزت لەچی جۆرە ماڵێکە؟ پیاوەکە دەڵێ حەزم لەوشـــتر یان دەڵێ حەزم لەڕەشـــەوڵاخە، ئیسحاق کە یەکێکە لەڕیوایەتەکانی ئەم فەرموودەیە گومانی لەوەدا پەیدا بوو کەبەڵەك و کەچەڵەکە کامیان داوای وشترو کامیان داوای ڕەشەوڵاخی کردبوو فەرمووی: جا ووشـــترەمێیەکی هەراش ئاوســـی لەسەر گوانی پێـــدا و ووتـــی: خوای گـــەورە پیت بەرەکەت و فـــەڕی تێ بخات بۆت فەرمووی:

٢- ئینجـــا فریشـــتەکە دەڕوا بـــۆ لای کەچەڵەکە پێـــی دەڵێ زیاتر حـــەزت لەچی یە؟ دەڵـــێ زیاتر حەزم لەقژێکی جوانە و ئەم کەچەڵی یەشم نەمێنێ، کە بەهۆیەوە خەڵك قێزم لێ دەکەنەوە فەرمووی: مەلا ئیکەکە دەستی دەهێنێ بەسەریدا و ئیتر کەچەڵیەکەی نامێنێ قژێکی جوانی پـــێ دەدرێ، ئینجا پێی دەفەرمووێ: حـــەز لەچی جۆرە ماڵـــێ دەکەی؟ دەڵێ: لەڕەشـــەوڵاخ، جامانگایەکی ئاوسی دەداتێ و پێی دەڵێ: خودا پیت و بەرەکەت و فەڕی تێ بخا بۆت.

٣- فەرمـــووی: ئینجـــا فریشـــتەکە دەڕوا بـــۆ لای کوێرەکە و پێی دەفەرمـــووێ: زیاتر حەزت لەچی یە؟ دەڵـــێ: زیاتر حەزم لەدوچاوی ســـاغ و گەشـــە ، کە خـــودا بیدا پێم هەتا ئەم خەڵکـــە یان پێ ببینم فەرمووی: جا دەســـتی دەهێنی بەچاوەکانیدا و خوای گەورە چاوەکانی پێدەبەخشێتەوە جا پێی دەفەرمووێ: ئەی حەز لەچی جۆرە سامانێك

دەکــەی؟ دەڵێ: لە مەڕ جا مەڕێکی زاوی بەرخ بە بەری دەداتێ، ئیتر بەرەبــەرە ئاژەڵــەکان زاوزێ دەکەن تا وا زۆر دەبــن، ئەمەیان بوو بە خاوەنی پڕ شیوێ وشتر ئەوەیان بوو بەخاوەنی پڕ دۆڵێ ڕەشەوڵاخ و ئەوەی تریشیان بوو بەخاوەنی پڕ شیوێ گەلە مەڕ!

فەرمووی: لەپاشــاندا فریشــتەکە خۆی لێ گۆڕین و لەسەر شێوە و شــکڵی ئەو ســای بەڵەکەکە خۆی، هاتەوە بۆلای و پێی گوت: پیاوێکی هەژاری داماوی ڕێبواری لێ قەوماوم ســەر بەهیچ لایەك دا دەرناکەم، ســا مەگەر یەکەم بە پشــتیوانی خودا و پاشان بەهۆی یارمەتی تۆوە بگەمەوە شوێن و ڕێگەی

خــۆم، جا تۆ لەبەر ئەو کەســەی کە ئەم شــێوە شــیرینە و ئەم لەش و لارە جوانە و ئەم ماڵە زۆرەی پێداوی وشــترێکم بدەرێ تالەم ســەفەرەدا خۆمی پێ بگەینمە ماڵەوە، کابرا ووتی: خاوەن بەشــەکان زۆرن بەرتۆ ناکەوێ!

فریشــتەکە پێی فەرموو وەك من تۆ بناسمەوە وایە، ئەرێ تۆ ئەو پیاوە بەڵەکە نیت کەخەڵك بێزی لێ دەکردیتەوە، وە ئەو هەژارە نیت کە خودا دەوڵەمەندی کردیت! گوتی: نەخێر من ئەم ماڵ و ســامانەم لە باو باپیرمەوە بۆ بەجێ ماوە، ئەوانیش هەر بوویانەو بەو شێوازە پشــتاو پشــت هاتۆتە خوارەوە: مەلائیکەکە دەلــێ ئەگەر درۆ دەکەی خودا وەك جاری جارانی خۆتت لێ بکاتەوە.

فەرمووی: جا لە شــێوەو شــکڵی پێشووی کەچەڵەکەدا چوو بۆ لای

ئەویش چی بە بەڵەکەکە وت، دیسان بەمیشی واوت وە بەڵەکەکە چی بە فریشتەکە ووت و دیسان کەچەڵەکەش ئەوەی پێ ووت. فریشتەکە ووتی ئەگەر درۆدەکەی خودا وەك جاری جارانی خۆتت لێ بکاتەوە!

فەرمووی: جا لەشـێوە و شـکڵی پێشـووی کوێرەکەشدا هاتەوە بۆ لای فەرمـووی: پیاوێکی هـەژاری داماوی ڕێبواری لێ قەوماوم سـەر بەهیچ لایەکا دەرناکەم، سـا مەگەر یەکەم بەپشـتیوانی خودا پاشـان بەهـۆی یارمەتی تۆوە بگەمەوە شـوێن و ڕێگـەی خۆم جا لەبەر ئەو خودایەی کە چاوەکانی چاکردیتەوە مەڕێکم پێ بدە تا لەم سەفەرەدا خۆمـی پێ بگەینمە ماڵـەوە، پیاوە کوێرەکە دەڵـێ: ئای منیش وەك ئیسـتای تۆ کوێر بـووم وە دەزانم کوێر چەند کۆڵـەوارە و وە خودا چاوی چاکردمەوە، سـەرەڕای ئەوەش هەژار بووم و خوا دەوڵەمەندی کـردم جا کەواتە بەئارەزووی خۆت چی دەبەی بۆ خۆت بیبە وە چی دەهێڵیتـەوە بۆ من ئـارەزووی خۆتە ، بەو خودایە هەرچی ئەمڕۆ تۆ بیبەیت بۆ خۆت لەڕێگای خودادا دەسـت ناهێنمە ڕێگەت فریشتەکە فەرمووی: ماڵی خۆت بۆ خۆت من فریشتەم پێویستم بە ماڵ و سامان نیە خوای گەورە ویسـتی تاقیتان بکاتەوە خـوا لەتۆ رازی یەو بەڵام لەهەردوو هاوڕیەکەت ناڕازی یە.

## فەرموودەی (١٠٠)

**سێ کەس لەنەتەوەکانی پێش ئێوە بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشتن.**

عن عبدالله بـن عُمر بن الخطّاب (رضي الله عنهما) قـال: سمعتُ رسولَ الله (ﷺ) يقول: ((انطلق ثلاثةُ رهْط ممَّن كان قبلكم، حتَّى أوَوا المبيتَ إلى غارٍ فدخلوه، فانحدرتْ صخرةٌ من الجبل فسدَّت عليهم الغار، فقالوا: إنَّه لا يُنجيكم من هذه الصَّخرة إلاَّ أن تدعوا الله بصالِح أعمالكم، فقال رجُل منهم: اللَّهُمَّ كان لي أبَوانِ شيْخان كبيران، وكنت لا أغْبق قبلهما أهلاً ولا مالاً، فنأى بي في طلب شيءٍ يومًا فلم أرُح عليهما حتَّى ناما، فحلبتُ لهُما غبوقَهما فوجدتُهما نائمَين، وكرهت أن أغبقَ قبلَهما أهلاً أو مالاً، فلبثْتُ والقدح على يدي أنتظِر استيقاظَهُما حتَّى برق الفجْر، فاستيْقَظا فشرِبَا غبوقَهما، اللَّهُمَّ إن كنتُ فعلتُ ذلك ابتِغاء وجْهِك، ففرِّج عنَّا ما نحن فيه من هذه الصَّخرة، فانفرجت شيئًا لا يستطيعون الخروج))، قال النَّبي (ﷺ): ((وقال الآخَر: اللَّهُمَّ كانتْ لي بنتُ عمّ، كانت أحبَّ النَّاس إليَّ، فأردتُها عن نفسِها، فامتنعتْ منِّي حتَّى ألمَّت بها سَنةٌ من السنين، فجاءتْني فأعطيتُها عشرين ومائة دينار على أن تُخلي بيْني وبين نفسِها، ففعلتْ، حتَّى إذا قدرتُ عليْها قالت: لا أحلّ لك أن تفضَّ الخاتم إلاَّ بحقِّه، فتحرَّجت من الوقوع عليْها، فانصرفتُ عنْها وهي أحبُّ النَّاس إليَّ، وتركت الذَّهَب الَّذي أعطيتُها، اللَّهُمَّ إن كنتُ فعلت ابتغاء وجهِك، فافْرُج عنَّا ما نحن فيه، فانفرجت الصَّخرة غير أنَّهم لا يستطيعون الخروج منها))، قال النَّبيُّ (ﷺ): ((وقال

الثَّالـث: اللَّهُمَّ إنّي استأجرتُ أُجراءَ فأعطيْتُهم أجرَهم غير رجُل واحدٍ ترَك الَّذي له وذهب، فثمَّرت أجْرَه حتَّى كثُرَت منه الأموال، فجاءني بعـد حين فقال: يا عبد اللــه، أدِّ إليَّ أجْري، فقلتُ له: كلُّ ما ترى من أجـرِك، من الإبـل والبقر والغنـم والرَّقيق، فقال: يـا عبد الله، لا تستهـزئْ بي، فقلـت: إنِّي لا أستهزئُ بك، فأخَذه كلَّـه فاستاقَه، فلم يترك منْه شيئًا، اللَّهُمَّ فـإن كنت فعلتُ ذلك ابتِغاء وجْهك، فافرجْ عنَّا ما نحن فيه، فانفرجتِ الصَّخرة، فخرجوا يَمشون[١٠٤]

ئەبو عەبدوڕەحمان عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب،ناسراو بە ئیبنوعومەر(ڕەزای خوای لێ بێت)فەرمووی:لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو:جارێ سێ کەس لە پێشینان بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشتن. باران دایکرد،جا شەوێ پەنایان بردە بەر ئەشکەوتێ لە کێوێ،تاوێرێ لە کێوەکە گل بووەوە و دەرگای ئەشکەوتەکەی قەپات کرد. جا لەناو خۆیاندا گوتیان سەیر بکەن بزانن چی کردەوەیەکی باشتان کردووە بۆ خوا،بەو کردەوانە لە خوا بپاڕێنەوە،سا بەڵکوو بەهۆی ئەو کردەوە باشانەوە خودا دەروتان لێ بکاتەوە و لەم تاوێرە ڕزگارمان بکا...

یەکێکیان ووتی: خودایە! خۆت ئاگاداری کە من باوك و دایکێکی ئەختیارم هەبوون،لەگەڵ چەند منداڵێکی ورددا شوانیم بۆیان دەکرد و،بەشوانی بەخێویانم دەکرد، هەموو جارێك کە دەگەڕامەوە بۆماڵەوە ڕانەکەم دەکردە پەچەوەو شیرم دەدۆشی وە لەپێشدا دەرخواردی

١٠٤- حديث صحيح انظر مختصر صحيح البخاري رقم ١٠٠٥



باوك و دایكمم دەدا، ئەوجا بەشی مندالّەكانی خۆشم دەدا، هەتا ڕۆژێك بەشوێن لەوەڕی باشدا دوركەوتمەوە و ، درەنگم بەسەرهات، كە هاتمەوە بۆ مالّەوە شەو بوو، ڕوانیم باوك و دایكم خەوتوون،منیش وەك جاران شیرم دۆشی و بۆم بردن و بەدیار سەریانەوە ڕاوەستام تاكەی خەبەریان بوویەوە شیرەكەیان بخۆنەوە،بەلاّم حەزم نەكرد كە خەبەریان بكەمەوە، وە پێشم ناخۆش بوو كە لەپێش ئەواندا شیر بدەم بە مندالّەكانم،مندالّەكانیشم لەووەختەدا لەبەر پێما لەبەرساندا،دەكروزانەوە،هەتا شەبەقی دا ئەمە حالّمان بوو،كە شەبەقی دا ئەوسا شیرەكەیان خواردەوە،جا ئەی خوایە! تۆ دەزانی كە ئەمەم لەبەر ڕەزامەندی تۆ كردووە،ئەوا دەروویەكمان لێ بكەرەوە كەلەبەرێكمان بۆ بكەوە ئاسمان ببینین!

جا خودا كەلەبەرێكی لێكردنەوە و ئاسمانیان لێوە دەركەوت و تاوێرەكە تۆزێ خزا،بەلاّم نەیان توانی دەربچن،

یەكێكی تریان ووتی: خودایە! خۆت دەزانی كە كچیكی ئامۆزام هەبوو،چەندە پیاو حەز لە ئافرەت دەكات ئەوەندە حەزم لێی بوو،كە داوای ئیشی خراپەم لێی كرد،خۆی نەدا بەدەستەوە،هەتا سالّێكیان دوچاری گرانی و قات و گڕی بوو،وەبەناچاری هات بۆ لام،سەد و بیست دیناری زێرم داپێی لەباتی ئەوەی خۆیم تەسلیم بكات،ئەویش وای كرد جا كاتێ دەستم لێی گیر بوو،لەناو كۆشیا دانیشتم و ویستم كارەكەی لەگەلّدا ئەنجام بدەم، كچەكە ووتی: ئەی عبدوللاّ! ئەی بەندەی خوا!

لەخوا بترســـە و ئەم مۆرە بە ناڕەوا مەشــکێنە،ئیتر منیش هەڵســام و وازم لێ هێناو پارەکەیشم پێـی دا بەخۆرایی بۆ خۆی،وەلەم حاڵەتەیشدا زۆر حــەزم لێـی بوو، جـا ئەی خوایە! تۆ دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر ڕەزامەنــدی تۆ کردووە،ئەوا دەرویەکمان لێ بکەرەوە لەم حاڵەتەی واین تیایدا، ئیتر خودا دەرویەکی تری لێکردنەوە و تا دووبەشــی توێرەکە لەسەر دەرگاکە لاچوو.هەر نەیان توانی بێنە دەرەوە و دەربازیان ببێ.

ســێهەمیان ووتی :ئەی خوایە! تۆ خۆت ئاگات لێ یە جارێ بە قزناخێ برنج کرێکارێکم گرت،کە ئیشەکەی تەواو کرد،ووتی کرێکەمم بدەرێ،منیش گوتم:کرێکــەت ئەوەتانێ کەچی بە دڵی نەبوو،وەری نەگرت،منیش کە ئەو ڕۆی پــارە و کرێــی کرێکارەکانی ترم هەموودا،وە چەڵتوکەکەی ئەویشــم هەموو ســاڵێك دەچاند و بەرهەمم دەهێنا،تا وا زۆر بوو گاگەلێك و ڕانە وشتر و مەڕ و چەند بەندەیەکم پێی کڕی ،تا ڕۆژێ کرێکارەکە هاتەوە بۆ لام،ووتی:لەخوا بترسە کرێکەمم بدەرێ،منیش ووتم: بڕۆ ئەو ڕانە وشتر و گاگەل و ڕانەمەڕ و شوانەکانیان ببە بۆ خۆت،هەمووی هین کرێکەتە،ووتی: ئەی عەبدی خوا! لەخوا بترســە گاڵتەم پێ مەکە،منیش ووتم:بەڕاســتمە گاڵتــەت پێ ناکەم هەمووی هین خۆتە ببیە،ئیتر ئەویش هەمووی برد بۆ خــۆی، جا ئەی خوایە تۆ دەزانی ئەگەر ئەمــەم لەبەر خاتری تۆ کردووە ئەوا دەرگای ئەشــکەوتەکەمان بەتەواوی بۆ بکــەرەوە، جا خودای گەورە دەرگای بەتەواووی بۆ کردنەوە و تاوێرەکە خزا و هاتنە دەرەوە و ڕۆیشتن.

## سەرچاوەکان:



١- فتح الباری شرح صحيح البخاری، للعسقلاني
٢- مختصر صحيح البخاری، مصطفى ديب البغا
٣- مختصر صحيح المسلم، مصطفى ديب البغا
٤-صحيح المسلم بشرح النووی، الامام النووی
٥-تحفه الاحوذي، المبارك الفوري
٦- عون المعبود، العلامة أبي طيب الابادي
٧-فيض القدير، المناوی
٨-نيل الاوطار، للشوكانی
٩- سبل السلام، للصنعانی
١٠- أدب المفرد، للبخاری
١١- صحيح جامع الصغير، ناصرالدين الالباني
١٢- الترغيب و الترهيب، المنذري
١٣-جامع الاصول، أبن الأثير
١٤- رياض الصالحين، نوری فارس حەمە خان
١٥- تاج جامع للاصول، نوری فارس حەمە خان
١٦- أقتران النيرين، مەلا ڕەشيد بەگی بابان
١٧- بلوغ المرام، للعسقلانی
١٨- سلسلة الاحاديث الصحيحة، للشيخ الألباني
١٩- صحيح سنن أبن الماجة، للشيخ الألباني
٢٠- صحيح سنن الترمذي، للشيخ الألباني
٢١- صحيح سنن أبي داود، للشيخ الألباني

## "پڕۆژەی خێرخوازی ئیمان"

ناســاندنی پڕۆژە: پڕۆژەیەکی ســەربەخۆ و بێلایەنــە، کۆمەڵێك لەخێرخوازان هەڵدەستن بە بەخشینی (کتێب و کاسێت) وهەموو جۆرە بابەتێکی بەسوود،بێ بەرامبەر، بەهەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگە، وە بڕێ تێچوی ئەم کارەش لە کەسانی خێرخواز وەردەگیرێت.

مێژوویــەك لەســەر پڕۆژەی ئیمــان: پڕۆژەی خێرخــوازی ئیمان، پڕۆژەیەکــی ســەربەخۆ و بێلایەنــە لە ســاڵی ٢٠١٣ وە دامــەزراوە و دەســتمان کردووە بــە چالاکییەکانمــان، چالاکی ســەرەتامان، کرینی چەند کتێب و نامیلکەیەکی بەســوود بوو بەناوی (قەڵای موســڵمان، وانەبێژی ســەرکەوتوو، بەختــەوەر بژی، ئاوێتەی دڵ، چل گوڵ، مافی دراوسێ، چۆن خۆمان ئامادە بکەین بۆتاقیکردنەوە، بەهەشت، دۆزەخ، قیامەت،.......... کۆمەڵێك کتێبی بەسوودی تر کە نوسخەی زۆرمان لێ کڕیوە و دابەشمان کردووە بەسەر خوێنەراندا، بێ بەرامبەر.

ســنوری کارکردنی: پڕۆژەی ئیمان تەنها لە ســێمانی و دەوروبەری کار دەکات

"سلێمانی.. تەکیە.. چەمچەماڵ...... هەندێ شار و شارۆچکەی تر."

هاوکاری گەیاندنتان، دڵســۆزی ئێوەی خۆشەویســتە، ئەگەر کەم تا زۆر بتوانن کەمێك لە قورسایی کارەکانمان کەم بکەنەوە.



هـــاوكارى گەياندنتـــان بە پـــرۆژەى خێرخـــوازى ئيمـــان كارێكى مرۆڤايەتييـــە و خزمەتێكـــى بچووكـــە بەمرۆڤايەتى، خـــوداى گەورە بەخشـــندەيە و مرۆڤى بەخشـــندەى خۆش ئەوێـــت، هاوكارمان بن بۆ ســـوودگەياند بە هەموو تاكەكانى كۆمەڵگـــە و هەوڵدان بۆ زيادبوونى خوێنەر لەكۆمەڵگەكەماندا.

بۆ هاوكارى گەياندنتان پەيوەندى بكەن بەم ژمارەيەوە.

ژ. م/ پڕۆژەى خێرخوازى ئيمان "٠٧٥١٠٤٣٢٦٢٠"

ياخود لە تۆڕى كۆمەڵايەتى فەيسبووك:

saiwan.jawhar96@gmail.com

## پێرست:

سێ کەس نزا و پارانەوەکانیان نادرێتە دواوە

سێ جۆرە کەس هەن ناچنە بەهەشتەوە

سێ کەسی تریش هەن ناچنە بەهەشتەوە

سێ کەس هەن مەلائیکەی ڕەحمەت نزیکیان نابیتەوە

سێ کەس هەن چاویان ئاگر نابینێت لە ڕۆژی دوایدا،واتە چاویان بە ئاگر ناسوتێ

سێ کەس هەن پرسیاریان لێ ناکرێت و دەبرێن بۆ ئاگری دۆزەخ

سێ کەس نوێژەکانیان لەگویچکەیان بەرز نابیتەوە

سێ کەس نزا و پاڕانەوەیان نادرێتە دواوە و ڕەت ناکرێتەوە

سێ کەس خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر خۆی یارمەتی یان بدات

سێ کەس  خوای گەورە ئەیان پارێزێ و سەرپەرشتیاریانە

سێ شت هەیە سوێندتان لەسەری بۆ دەخۆم

سێ کەس هەن دوو پاداشتیان بۆ هەیە

سێ کەس هەن من لەڕۆژی دوایدا دوژمنایەتیان لەگەڵدا دەکەم

سێ کەس بەڕاستی خوای گەورە بەهەشتی لەسەر قەدەغەکردوون

سێ کەس هەن داوا لەخوا دەکەن داوا کەیان وەرناگیرێت

سێ کەس قەڵەمی تاوان نوسینیان لەسەر هەڵ گیراوە

سێ کەس ڕەوایەبۆیان سواڵ کردن

سێ شت چارە سەر و شیفای تێدایە

سێ جۆر خەو بینین هەیە

سێ شت بەو قومی و شومیان تێدایە

سێ کەس بۆیان هەیە زەوی دابچێنن و کشتوکاڵ بکەن

سێ شت هەموو ئیش و کارەکان تێیدا کورت هەڵهاتووە

سێ جۆر دادوەر و قازی هەن

سێ شت فەڕ و بەرەکەتی تێدایە

سێ کۆمەڵ ڕاپێچو و پەلکێشی جەهەنم دەکەم

سێ کەس بەهەشت تامەزرۆیانە

سێ کەس خوای گەورە ڕق و تورەی زۆری لێیانە

سێ کەس وەفدی خوای گەورە و پەروەردگارن

سێ جۆر دەست هەیە

سێ کەس هەن ئەهـلی بەهەشتن

سێ جۆر زوڵم و ستەم هەیە

سێ شت شوێنی مردوو دەکەوێ

سێ جۆر کەس ئامادەی نوێژی هەینی دەبن

سێ پیاو لەپەنایی کەعبەدا مشتومڕیان بوو

سێ شتی لەخوای گەورە داوا کرد سولەیمان (علیه السلام)

سێ مەلائیکە دێن بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم)

سێ شت مایەی بەختیاری و خۆش گوزەرانی یە بۆ مرۆڤ سێ شتیش مایەی بەدبەختی و ناڕەحەتی یە بۆ مرۆڤ

سێ کەس بەرەوڕوی پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم) هاتن

سـێ کەس ڕۆیشتن بۆماڵـی یەکێ لەهاوسـەرەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم) لەبارەی پەرستش و بەندایەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم) پرسیاریان کرد

سێ جۆر و شێوازیان هەیە جنـــۆکە

سێ بەشی سەرەکییە نوێژ

سێ مزگەوت دروستە سەفەریان بۆ بکەیت بۆ پەرستش و بەندایەتی

سێ دێڕ بوو مۆری ئەموستیلەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم)

سێ شتە نیشانەی مرۆڤی دوو ڕوو (المنافق)

سێ کات دروست و ڕەوایە درۆی تێدا بکەیت

سـێ شت پێشتر بەرگریم لێکردبوون ئیستە فەرمانتان پێ دەکەم ئەنجیامیان بدەن



لەسێ شتدا ڕام لەگەڵ فەرمانی خوادا یەکی گرتووە

سێ کردەوە هەیە ئەنجامدانیان دەبێتە هۆی لەعنەت لێکردن

سێ ڕێگا هەیە بە یەکێ لەم سێ ڕێگایە دروستە ڕشتنی خوێنی موسڵمان

سێ شتم لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم) بیستووە دەربارەی بەنی تەمیم بۆیە لەو کاتەوە خۆشم دەوێن

سێ شت هەیە یەکێکیانی هەر پێدەخشرێت کەسێك نزای خێر بکات

سێ گاڵتە و گەپ هەیە پاداشتیان لەسەر وەردەگیرێت

سێ ڕێگا هەیە مرۆڤی موسڵمان لەو ڕێگایانەوە نەبێت خێر و خێراتی پێ ناگات

سێ شت هەیە پێغەمبەر(صلی الله علیه وآله وسلم) فرمانی پێ کردم تا مردن تەرکیان نەکەم

سێ شت هەیە پێغەمبەر(صلی الله علیه وآله وسلم) ئامۆژگاری کردم بەو سێ شتە.

بە سێ شت پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم) ئامۆژگاری کردین لە سەرەمەرگدا

سێ شت هەیە هەتا ئەو سێ شتە ئەنجام بدەن فەرمانڕەوا هەر لە قورەیشە

سێ شت هەیە خوای گەورە زیادەڕێزی پێداوین بەسەر گەلانی پێشوودا بەو سێ شتە

سێ شتی بۆ هەیە مرۆڤی موسڵمان لەماڵی خۆیدا.

سێ شێواز هەیە مرۆڤ لە ڕۆژی دوایدا لەسەر یەکێك لەو سێ شێوازە حەشر دەکرێت.

سێ شت هەیە هەر کەسێك بێوەی بێت لێی دەڕواتە بەهەشتەوە.

سێ سورەت هەیە گەورەترین ناوی خوای تێدایە هەر کەسێك داوایان پێ بکات وەڵام دەدرێتەوە

سێ گرێ ئەدات لە پشت سەری مرۆڤ (شەیتان) لە کاتی خەوتندا

سێ شت هەیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم) فەرمووی : بە ئیمام علی (ڕەزای خوای لێ بێ) دوایان مەخە

سێ شت هەیە خوای گەورە ڕازی یە ئەنجامی بدەن، وە سێ شتیشی پێ ناخۆشە ئەنجامی بدەن.

سێ شتی پێبەخشرا پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم) کاتێك شەوڕەوی پێکرا بۆ ئاسمان

سێ شت هەیە داوام لەخودا کرد،دوانیانی پێ بەخشیم.



سێ ڕۆژ بەرۆژووبە لەمانگێکدا ئەگەر بەڕۆژوو بوویت

سێ شتە گەورەترینی گوناهی گەورە

سێ شتم پێببخشە ئەی پێغەمبەر خوا!

سێ جۆرە وڵاخی بەرز بەپێ ی نیازی خاوەنەکەی (ئەسپ و ماین ، هێستر ....)

ســێ شت هەیە تا لەیادم بێ پێغەمبەر (ﷺ) دەرحەق بە عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی قەت قسەی پێ نالێم

ســێ قســە هەیە هەر کەســێ یەکێکیان بکات درۆیەکی گەورەی بەدەم خواوە کردووە

سێ شت هەیە دەبێ دوژمنی بۆ بانگ بکەیت پێش ئەوەی شەڕی لەگەڵدا بکەیت

سێ درۆ نەبێت ئیبراهیم (علیه السلام) قەت درۆی نەکردوە.

سێ پرسیار هەیە کەسێك پێغەمبەر نەبێت نایزانێت.

سێ کەس نەبێ لەپیشکەدا کەس قسەی نەکردووە

ســێ کەس لەنەوەی ئیسرائیل بەڵەکێك و کەچەڵێك و کوێرێك خوای گەورە ویستی تاقی یان بکاتەوە

سێ کەس لە نەتەوەکانی پێش ئێوە بە ڕێگایەکدا دەڕۆشتن

## ١٠٠ فەرموودە ی سیانی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

١- ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فيه وَجَدَ بهنَّ حَلَاوَةَ الْإيمَان
٢- ثَلَاثٌ إذَا خَرَجْنَ لَمْ يَنْفَعْ نَفسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ
٣- ثَلَاثُ دَعَوَاتٍ مُسْتَجَابَاتٍ لا شَكَّ فيهِنَّ
٤- ثلاثُ خصالٍ من سعادَةِ المرْءِ المَسلِمِ في الدنيا
٥- ثلاثٌ كُلُّهُنَّ حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ
٦- ثَلاثُ ساعات كان رسول الله (ﷺ) ينهانا أَن نصلي فيهن
٧- ثَلاثٌ أَخَافُ عَلَى أُمَّتي
٨- ثَلَاثٌ مِنْ فِعْلِ الْجَاهِلِيَّةِ لا يَدَعُهُنَّ أَهْلُ الإِسْلامِ
٩- ثلاث من فعلهن فقد طعم طعم الإيمان
١٠- ثَلاثٌ مُهْلِكَاتٌ ، وَثَلاثٌ مُنَجِّيَاتٍ
١١- ثَلَاثٌ حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ
١٢- ثَلَاثٌ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَعْمَلُ بِهِنَّ، تَرَكَهُنَّ النَّاسُ
١٣- ثلاث من أخلاق النبوة
١٤-ثَلَاثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ
١٥- ثلاث لا يغل عليهن قلب المؤمن
١٦- ثَلَاثٌ لَا يُمْنَعْنَ
١٧-ثَلَاثٌ أَحْلِفُ عَلَيْهِنَّ
١٨- ثلاث لا ترد
١٩- ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمْ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ
٢٠- ثلاثة لا يكلمهم الله يوم القيامة ولا ينظر إليهم
٢١- ثَلاثَةٌ لا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ
٢٢- ثَلَاثَةٌ لَا يَرُدُّ الله دُعَاءَهُمْ
٢٣- ثلاثة لا يدخلون الجنة
٢٤- ثلاثة لا يدخلون الجنة أيضا
٢٥- ثلاثة لا تقربهم الملائكة
٢٦- ثلاثة لاترى أعينهم النار
٢٧-: ثَلاثَةٌ لا تُسأَلُ عَنْهُمْ
٢٨- ثلاثة لا تجاوز صلاتهم آذانهم

٢٩- ثَلاثَةٌ لا تُرَدُّ دَعْوَتُهُمْ
٣٠- ثلاثة حق على الله عَوْنُهُمْ
٣١- ثلاثَةٌ كُلُّهُمْ ضَامِنٌ عَلَى اللّه
٣٢- ثَلَاثَةٌ أُقْسِمُ عَلَيْهِنَّ حَدِيثًا فَاحْفَظُوهُ
٣٣- ثَلاثَةٌ لَهُمْ أَجْرَانِ
٣٤- ثَلَاثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَة
٣٥- ثَلاثَةٌ قَدْ حَرَّمَ اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِمُ الْجَنَّةُ
٣٦- ثلاثة يدعون الله، فلا يستجاب لهم
٣٧- رفع القلم عن ثلاثة
٣٨- إن المسألة لا تحل إلا لأحد ثلاثة
٣٩- الشِّفَاءُ في ثَلَاثَة
٤٠- الرؤيا ثَلاثٌ
٤١- إنما الشؤم في ثلاثة
٤٢- إِنَّمَا يَزْرَعُ ثَلاثَةٌ
٤٣-: إنما الأمور ثلاثة
٤٤- القضاة ثلاثة
٤٥- الْبَرَكَةُ في ثَلَاثَة
٤٦- يَخْرُجُ عُنُقٌ مِنَ النَّارِ فَيَقُولُ: إِنِّي وُكِّلْتُ بِثَلَاثَةٍ
٤٧- إِنَّ الْجَنَّةَ لَتَشْتَاقُ إِلَى ثَلَاثَة
٤٨- أَبْغَضُ النَّاسِ إِلَى اللَّه ثَلَاثَةٌ
٤٩- وفد الله ثلاثة
٥٠- الأَيْدِي ثَلاثَةٌ
٥١- يَقول أَهْلُ الْجَنَّة ثَلاثَةٌ
٥٢- الظُّلْمُ ثَلَاثَةٌ
٥٣- يَتْبَعُ الميّتَ ثَلَاثَةٌ
٥٤- يَحْضُر الجُمُعَة ثَلاثَةُ نَفَر
٥٥- اخْتَصَمَ عِنْدَ الْبَيْتِ ثَلَاثَةُ

٥٦- إِنَّ سُلَيْمَانَ بْنَ دَاوُدَ لَمَّا بَنَى مَسْجِدَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ سَأَلَ اللَّهَ خِلالا ثَلاثًا

٥٧- أُسْرِيَ بِالنَّبِيّ (ﷺ) في مَسْجِد الْكَعْبَة " أَنَّهُ جَاءَ ثَلاثَةُ نَفَرٍ

٥٨- من سَعَادَةُ لابْنِ آدَمَ ثَلاثَةٌ ، وَشَقَاوَةٌ لابْنِ آدَمَ ثَلاثَةٌ

٥٩-أن رسول الله (ﷺ) بينما هو جالس في المسجد والناس معه إذ أقبل نفر ثلاثة

٦٠- جاء ثلاثة رهط إلى بيوت أزواج النبي (ﷺ)

٦١- الْجِنُّ عَلَى ثَلاثَة أَصْنَافٍ

٦٢-الصَّلاةُ ثَلاثَةُ أَثْلاث

٦٣- لا تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاثَة مَسَاجِدَ

٦٤- كان نقش خَاتَمَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلاَثَةَ أَسْطُرٍ

٦٥- آيَةُ الْمُنَافق ثَلاَثٌ

٦٦- لا يَحِلُّ الْكَذِبُ إلا في ثَلاثٍ

٦٧- نهيتكم عن ثلاث وأنا آمركم بهن

٦٨- وَافَقْتُ رَبِّي في ثَلاث

٦٩- اتَّقُوا الْمَلاعِنَ الثَّلاثَ

٧٠- لا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، إِلا بِإِحْدَى ثَلاثٍ

٧١- ما زلت أحب بني تميم منذ ثلاث سمعت من رسول الله (ﷺ)

٧٢- ما من مسلم يدعو بدعوة ليس فيها إثم ولا قطيعة رحم إلا أعطاه الله بها إحدى ثلاث

٧٣- اللَّهْوُ في ثَلاث

٧٤- إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلا مِنْ ثَلاثٍ

٧٥- أَوصاني خليلي صلى الله عليه وسلم بثلاث

٧٦- أَوْصَاني خَلِيلِي أيضا بِثَلاثٍ

٧٧- أوصيني بثلاث

٧٨- الأُمَرَاءُ مِنْ قُرَيْشٍ مَا عَمِلُوا فِيكُمْ بِثَلاثٍ

٧٩- فُضِّلْنا عَلَى النَّاسِ بِثَلاثٍ



٨٠- يَقُولُ الْعَبْدُ مَالِي مَالِي ، وَإِنَّمَا لَهُ مِنْ مَالِهِ ألا ثلاث
٨١-يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى ثَلَاث طَرَائِقَ
٨٢- مَنْ فَارَقَ الرُّوحُ الْجَسَدَ وَهُوَ بَرِئٌ مِنْ ثَلاث دَخَلَ الْجَنَّةَ
٨٣- اسْمُ اللَّه الأَعظَمُ الذي اذا دعي به أَجاب في سُوَرٍ مِنَ القُرآن ثَلَاثٍ
٨٤- يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَ نَامَ ثَلاثَ عُقَدٍ
٨٥- يا علي ثلاث لا تؤخرها
٨٦- إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَرْضَى لَكُمْ ثَلاثًا ، وَيَكْرَهُ لَكُمْ ثَلاثًا
٨٧- أُسْرِيَ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، انْتُهِيَ إِلَى سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى وأعطي ثلاثا
٨٨- سَأَلْتُ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ ثَلاثًا
٨٩- إِذَا صُمْتَ مِنَ الشَّهْرِ ثلاثا
٩٠- أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ ثَلَاثًا
٩١- يَا نَبِيَّ اللَّهِ ، ثَلَاثٌ أَعْطِنِيهِنَّ
٩٢- الْخَيْلُ لِثَلاثَةٍ
٩٣- أَمَّـا مَا ذَكَرْتُ ثَلَاثًا ، قَالَهُنَّ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، فَلَنْ أَسُبَّهُ
٩٤- ثَلاثٌ مَنْ تَكَلَّمَ بِوَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللَّهِ الْفِرْيَةَ
٩٥- وإذا لقيت عدوك من المشركين فادعهم إلى ثلاث خصال
٩٦- لم يكذب إبراهيم النبي عليه السلام قط إلا ثلاث كذبات
٩٧- ثلاث لا يعلمهن إلا نبي
٩٨- لَمْ يَتَكَلَّمْ فِي المَهْدِ إِلَّا ثَلَاثَةٌ
٩٩- إن ثلاثة في بني إسرائيل أبرص وأقرع وأعمى
١٠٠- انطلق ثلاثةُ رهطٍ ممَّن كان قبلكم